


دەزگای فام

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری





چاپی یەکەم - ٢٠٢٢


# ئەو گوڵەگەنمانەی بوونە گسك

نووسینی

## تەڵعەت تاهیر


پێوانە: ١٣.٥*٢١سم (٢٦٠) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٣٧٩)ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆک

کە گەیشتین، بینیمان چەند برادەرێکی دیکەش لەوێن..

هەر لە پەنجەرەی ئەو ژوورەی دەکەوتە بەرامبەرمانەوە، لە پشتەوە جەستەی ئەو نووسەرە سەربرنجییە دیاربوو، لەسەر کورسییەکی پلاستیکیی قاوەیی دانیشتووە و لەسەر مێزەکەیدا دەیان کتێب و دەستنووسی پەرشوبڵاو هەن، ئەوە هاوڕێ نووسەرەکەمان بوو، لە تەمەنی شەست و سێساڵیدا سەری بەسەر دەفتەرێکی بۆنخۆشدا شۆڕبۆتەوەو مردووە، هەموو ئەوانەی لە دەوری جەستە شیعر تیا نەماوەکەی وەستابوون، ئاخ و هەناسەی قووڵیان هەڵدەکێشا، دیاریش نەبوو لە خەفەتی نووسەرەکەیە یان لەبەر ئەو بۆنە خۆشەی ژوورەکەی تەنیبوو.

ماڵی ئەو نووسەرە، خانووێکی کۆنی ساڵانی سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردووە، بە بەرد و خشت لە لایەن جووتیارێکی مەخموور دروست کراوە، هەر کەسێکیش، لەو چێشتەنگاوە لەگەڵ ئێمەدا لە شەستمەترییەوە بهاتایەتە جادەی ئەلبان، لە گەڕەکی کوران بەدیوی چەپدا هەژدە کۆڵانمان دەژمارد و دەچووینە ناوەوە. دووەم ماڵ خۆی بوو، پاڵێکی هێواشمان پێوە دەنا و دەرگا کۆنە زەردباوەکە خۆی دەکرایەوە، دوو ژوور و هەیوانێك بوو کە تەنها بە کەڵکی ئەوە دەهات باوکەکە لە ترسی چیرۆکی کەنعان، لە ترسی گورگەکانی ئەو زەمانە، هەموو ئێوارەیەك یەك بە یەك، وەك ئەوەی ڕانەمەڕ بن، منداڵەکانی بژمێرێتەوە. لە دیوارەکانیدا کۆمەڵێك وێنەی ڕتووشکراوی چەند خزمێك هەڵواسرابوون، بزمارەکانیان هێندە

گەورە بوون، لەوە دەچوو لە دەست و پێی حەزرەتی مەسیح کرابنەوە پێش ئەوەی لەسەر خاچەکەیدا بفڕێتە ئاسمان.

دوای تێکچوونی نێوانی کورد و ڕژێمی بەغدا و هێرشی حەرەس قەومییەکان لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، حاجی تاهیر پێی لە جەرگی خۆی نا و لە قەراج چەند سەرەمەڕێکی حەمدانی فرۆشت و لە گەڕەکی کوراندا لەنزیك حەمامی قەرەچووخ ئەو ماڵەی دروست کرد. ئەوسا خێزانێکی یانزە کەسی تێدا دەژیا، ئەمەش وای کردبوو تەواو لە چارەنووسی کەنعانبوونی خۆی بترسێت. تاهیر گوریێ، دواتر لە خەستەخانەکەی گەڕەکی زانیاری بە باخەوان دامەزرا.

لە سەردەمێکدا پیاوەکان ناوی زۆربەی بێوەژنەکانیان دەزانی، ئەو تەنها ناوی گوڵ و دار و درەختی لەبەر بوو، تەنیا گوڵی حوسنی خانم و زیزێ خانمی هاوسەری دەناسی، وەك بەدرۆخستنەوەیەکی دەگمەن بۆ هەموو ئەو قسە هەقانەی سەبارەت بە کارەساتی ژن و مێردایەتی دەکرێن، ژنەکەی خۆی خۆش دەویست، پێنج فەرزە تەسبیحەکەی لە شێوەی دڵ لەسەر بەرماڵی نوێژکردنەکە بەجێ دەهێشت، جار جارەش سەد فلسی و گەردانەیەکی هەرزان و چوکلێتیشی تێ دەکەوت. وەك نەمامی پەنجەخانم دەبووایە ڕۆژانە بە دیواری زبری کاسبیدا هەڵبگەڕێت. وەك گوڵە بەیبوون خۆی دەکولا تاوەکوو خانەوادەکەی تووشی سکێنیشە نەبن، وەك ڕووەکی چاوبازە سەری پڕ دڕك بوو، بەلام لە خوارەوە دەستەکانی پڕ بوون لە

نوقڵی مزر. خۆی قژی ڕووتابۆوە و دەشیزانی ڕۆنی تۆوی گەرچەك بۆ بەهێزکردنی موو باشە، کەچی سەری کوڕە گەورەکەی پێ چەور دەکرد نەوەك وەکوو خۆی، پاشان ئەسلەع بێت، ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە ئەو کوڕەی جیا لە هەمووان، قژێکی پڕی ئەو سەردەمانەی هەیە کە هێشتا مەراق بەم شێوەیەی ئێستا فێری ڕووتاندنەوەی سەرەکان نەبوو. بەری سنەوبەری دێنا و لەگەڵ کەمێك ڕۆنی زەیتووندا دەیکوڵاند، بۆ نەمانی هاژە هاژی دنیا لە گوێی دەکرد. خەفەتی لەوە دەخوارد کە دەیانگوت گوڵەهێرۆ بۆنی نییە. ئەو مەراقە دەیکوشت کە گوڵەبەڕۆژە شەوان چی دەپەرستێت؟! جیاوازی نەدەکرد لەنێوان پێگرتنی منداڵێك و کرانەوەی شەوبۆیەك. گەڵای مێوی دەهێنایەوە و ژنەکەی لەجیاتیی برنج، وردە ئارامیی تێدا دەپێچایەوە و بۆ ئەولادەکانیان لەسەر تەباخێکی بچووکی شینی فتیلەداری دادەنا. هەژار بوو، بەڵام ئیمانی شك دەبرد، چونکە هەژاریی بێ ئیمان کارەساتێکە وەسف ناکرێت.

حاجی تاهیر، باڵایەکی درێژی وەك دار قەزوانی هەبوو، زوو زوو بریندار دەبوو، کەچی وەکوو دار قەزوان لە برینەکانیدا جۆرە خوێنێکی چڕی وەکوو بنێشتی لێ دەچۆڕا و منداڵەکانی لەگەڵ دنیا بەیەکەوە دەنووساندەوە. بەژنی درێژ و تەمەنێکی کورتی شك دەبرد، سەدان ئومێدی هەبوو و یەك قەبری شك دەبرد، هەزاران دوعای هەبوو و یەك خودای شك دەبرد. زۆر ڕقی لەوە بوو منداڵەکانی لە سەربانەدا کۆتر بەخێو بکەن، پێ دەچوو بەهەموو فڕینێك مردنی بیر بکەوێتەوە. چێشتێکی

خۆشیان هەبووایە وەکوو گوڵەمیناکانی باخچەی خەستەخانەی زانیاری، ستایشی ژنەکەی دەکرد. یەك جار پێلەقەی لە مەنجەڵی خواردنێك دا، دواتر زانرا ئەو لەقەیەی لە خەفەتی کوڕە گەورەکەیەتی لە عەسکەری لە وادەی گەڕانەوەی تاخیر ببوو، پلکە "زێڕێ"ی خێزانیشی لە شێوەی ئەرسۆلای ناو ڕۆمانی "سەد ساڵ تەنیایی"ی مارکیز، هەرچەندە دەیزانی ئەم دنیایە دڕندەیە و هی ئەوە نییە تیایدا کەروێشك بەخێو بکرێت، تاکە خەمی ئەوە بوو منداڵی زۆر بخاتەوە، دەیویست وەکوو گوڵەشیلانەکانی باخچەی مێردەکەی ڕەگ و بنەچەی درێژ ببێتەوە. لەوانەیە هۆکار ئەوە بووبێت کە خۆی و مێردەکەی تاقانە و بێکەس بوون.

کوران، گەڕەکی ئەو نووسەرەمان، گەڕەکێکی هەژارنشینی پڕ لە پێکەنین بوو. لە سەدەی سیانزەهەمەوە وەك تاکە گوندی نزیك قەڵاتی هەولێر لە کتێبە نازدارەکەی ئیبن مستەوفیدا "تاریخ ئەربل" ناوی هاتووە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە بەوە ناسراوبووە کە کورەی خشتی لێ بووە و خۆڵەکەی زۆر شیاو بووە بۆ هەڵکەندن و دەرهێنانی خۆڵی تایبەت بە خشت و هەر بە هۆی ئەو کوورە خشتانەوەش ناوی نراوە: کوران.

زۆر جار لە کاتی شەهیدبوونی گەنجێك بە دەستی بەعسی و جاشەکانەوە، یان خنکانی ساوایەك لە چاڵە قووڵە پڕ قووڕاوەکانی، یان بزرکردنی گوارەیەك لە جۆگەڵە پیسەکانی، دەمانبیست پیرەمێردەکان جنێو بەو کوورەچییانە دەدەن و

نەفرەت بۆ باب و باپیرانیان ڕەوانە دەکەن، چونکە هێندەیان خۆڵ لێ دەرهێنابوو بەشی سەر بەقوڕکردنی بۆ نەهامەتییەکان نەدەکرد.

لەو سەردەمەی ئیبن مستەوفییەوە تا دەگاتە زەمانی ئەم نووسەرەمان، ئەوەی گۆڕابوو تەنها ئەوە بوو خەڵکەکەی کەمێك تەمەنیان درێژتر ببوو، کە ئەمەش بۆ کەسە بێدەرامەت و منداڵ زۆرەکان هەواڵێکی هێندە خۆش نییە! دەنا هێشتا لەو گەڕەکە: بۆنی سەرگەردانیی تێکەڵ بە بۆنی گیای سەر مەنجەڵە ماستەکان دەبوو، بۆنی هەژاری و بۆنی چڵپاوی بەردەم ماڵەکان، بۆنی ماسیی ڕاکشاوی سەر خوێی درشت، بۆنی ئارەقەی لەتەنیشت یەکتر خەوتنی یازدە منداڵ و نەوتی ئەو چرایەی شەوی کەسیانی ڕووناك نەدەکردەوە، بۆنی پاقلەی کوڵاو کە تێکەڵ بە بۆنی گۆرەویی ئەو پیرەمێردانە دەبوو لە کاتی دامەکردندا بە پێخواسی دادەنیشتن، بۆنی ئەو ماکسییانەی لە حەوشەکاندا لەبەر ڕتووبە ڕەق هەڵگەڕابوون.. ئەدرێسی یەك ئاراستە بوون کە دەکرێ پێی بگوترێ: مەینەتی.

باشترین زۆرخۆر و مێباز نەیاندەتوانی جیاوازیی نێوان بۆنی سووتانی جەرگی ژنەکان و بۆنی برژاندنی جگەری مریشك بدۆزنەوە. ئەو خەڵکە و ئەو گەڕەکە لە خواری خوارەوەی جیهاندا دەگوزەران، وەك ئەوەی پێڵاوی ڕۆژگار بن، وێڕای ئەو عەتری ناوکەفەی بەسەر ماڵەکاندا دەپژا، نێوانیان لەگەڵ ڤایرۆسەکاندا باش بوو، لەگەڵ بەکتریادا بوونە خزم، بە

غەرغەرەکردنی هەواڵێکی سوێری وشکەساڵی قوڕگێتیشەیان چارەسەر دەکرد، بە سەری دڕکاوی کەنگر منداڵە ساواکانیان لە دژی نیشانەکانی زۆرخۆری دەکوتا، بە بۆنکردنی گندۆرەیەك خڕۆکەی ڕەشیان سپی دەبۆوە، بە جووینی دوو تەڵە تۆڵەکە بەنج دەبوون، نێوانیان تەنها لەگەڵ حاکم و دکتۆرەکان باش نەبوو، ڕدێنسپییەکان دەیانگێڕایەوە چۆن لەوەتەی هەن حاکمەکان تەنها لە دژی هەژاران دادپەروەری جێبەجێ دەکەن؟! چۆن پیرەژنەکانی گەڕەکەکیان دەبرد دوای ماڵ پاککردنەوە و باخچە چاککردن پارەیان نەدەدا؟! بۆیە هیچ کاتێك ژنە حاکمێك بۆی نەبوو لەو بازاڕە میوە بە دەستی خۆی هەڵبژێرێت، ئەو کەڵەشێرانەیان دەدانێ کە مریشکەکان ئیحتیرامیان نەدەگرتن، بە فیکەیەك بە ئەسپێی ناو ئاردیان دەگوت ڕاکەن بۆ ژنە حاکم دەکێشین، بە لێدانێکی هێواشی دەسکە چەقۆیەك بە شووتییان دەگوت: بۆ ماوەی سەعاتێك شەرم لەو زوڵمانە بکە لێمان کراوە و سوور هەڵگەڕێ. کاتێك خزمەتکارێکی ماڵی حاکمێك دەهات و دەیگوت:

- جەنابی حاکم بە فەڕاشەکەی گوتووە بە من بڵێت، منیش پێتان بڵێم، ئێوەش بە دوکاندارەکانی دیکە بڵێن، ئەوانیش بە ئەوانیتر بڵێن: ئەم دوکانانەتان نایاسایین و بە هیچ شێویەك باسی پارە نەکەن!

خەڵکەکەش دەیانگوت:

- خودایه به جوبرائیل بڵێ، به ئیسرافیل بڵێت، به عیزرائیل بڵێت: ڕۆحی ئەو بەخیلە بکێشێت!

ئەوە ژنە دکتۆریش لەولاوە بوەستێ، پێویستی بە ڕدێنسپییەکان نەبوو کە ئەو دکتۆرانە چەند بە لووتی بەرز و بێویژدانییەوە لە خەڵکی ئەم گەڕەکەیان دەڕوانی: دڵخۆش بوون بە خەتی خوار و خێچی خۆیان و پارە بە ئارەق ڕزیوەکانی ئێمە، بە ناوی تەندروستییەوە خۆیان لێ بووبووە خودا، ئەو ڕاچێتانەی کەس تێنەدەگەیشت و لە نووشتە دەچوون لێیان ببووە ڕاست و.. بێشەرمانە لەجیاتیی مەلاکان فەتوایان دەدا:

- باوکت مانگێك و حەڤدە ڕۆژی ماوە بمرێت!

- ئێ؟!

- ڕێگەی پێ دەدەم هەفتەی جارێك ملەقۆتەیەکی مریشك بخوات و لە نێوان شەو و ڕۆژێکیش قەینا با دوو قوم جگەرە بکێشێت!

وێڕای ئەو نادادپەروەری و تەمەنکورتییەش، هێشتا خەڵکەکە بە توانجی شیرین و قسەی خۆشەوە دەردەدڵیان دەکرد، هەموو نەهامەتییەکانیان دەخستە ناو ئامێری دەمێکی بە پێکەنین کراوەوە کە دەکرا هەتا ماون بە دیاریەوە بگرین. بە توندی ڕۆ چووبوونە ناو ژیان، پتەو و سەنگین بوون، تەنانەت زۆربەمان قسەی ئەو کابرایەمان بیر ماوە کە بەرەبەیانییەك سەگەکان پەلاماری دەدەن

و دەیەوێت بەردێك هەڵگرێتەوە و لە خۆڵەکە بۆی دەرنایە، بە شپرزەیی هاواری دەکرد: ئەم گەڕەکە چەند سەیرە، سەگیان بەڕەڵا کردووە و بەردیشیان بەستاوەتەوە!

یەك هەڵهەڵەی نادیار بەس بوو، سێ سێ و چوار چوار لە پەنا دیوارێکەوە بیکەنە شایی.

چاڵە قوڕاوییەکانیشی بە قاچی هەمووان دەبوونە حەوزی ژیان، پێچەوانەی سوهراب، ئەوسا ژیان حەوزی مۆسیقا نەبوو، مۆسیقای حەوز بوو. تەنانەت لە تۆپانێش نەك بەس لە ژیان، کە نەهامەتی هێرشی دەهێنا هەمووان بەیەکەوە بەرگرییان دەکرد، یەك نوکتە بەس بوو قاقایان بگاتە گوێی ئەو منداڵانەی لە قوتابخانەی "شاکر فەتاح"دا بە شوێن بیانووێکەوە دەگەڕان تا سروودی نیشتیمانی بکەنە لاساییکردنەوەی حەیرانێکی ڕەسووڵ بێزار گەردی.

پێکەنین و هەژاری، پەیوەندییەکی لەمێژینەیان هەیە، خۆ لەوانەیە هی ئەوە بێت کە هەژارەکان هەست دەکەن زووتر لە خەڵکی تر دەمرن. لە شەڕیشدا خەندە هەبوو، جارێك لە شەڕێکدا دوکاندارێك بە دراوسێیەکی گوتبوو:

- زللەیەکت لێ بدەم دەتنێرمە بەغدا!

ئەویش لەسەرخۆ گوتبووی:

- دە دوو زللەم لێ بدە و بمگەیەنە سعوودیە، خۆ بەم نەدارییەوە حەجکردنم بە نسیب دەبێ!

جار هەبووە کە دوکاندارێك دەیویست گاز لە ترۆزی یان خەیارێك بدات، خێرا دەیانگوت بوەستە عوسمان تەسجیلچی هات! نەوەك عوسمان قسەیەك بکات و پارچە ترۆزییەك کابرا بخنکێنێ، جارێك کەلکی نەك ترۆزی، بەلکوو ئاوخواردنەوەشی نەما کە عوسمان لە دوکاندا پەرداخێك بەنزین دادەنێ بۆ پاککردنەوەی خەریتەی ڕادیۆ و تەسجیلەکان و فەیسەڵ تینووی دەبێت، دەچێتە لای و بێ سلاوکردن پەرداخە بەنزینەکە دەخواتەوە! هاوار دەکا هەناوم سووتا.. عوسمان بانگی عەلیی برای دەکات کە بگاتە فەیسەڵ بەنزینی خواردۆتەوە و خێرا دەستی دەگرن تا بیبەنە لایِ تەهای موزەمید، پەنجا مەترێك دەڕۆن و فەیسەڵ بەردەبێتەوە، عەلی بە عوسمان دەڵێت: عوسمان براکەم مرد و تۆ کوشتت..!

عوسمانیش لەسەرخۆ دەڵێ: کەرە نەمردووە، ئەوە بەنزینەکە تەواو بوو!

پاش ئەم کێشەیە عوسمان بە سوراحی بەنزینی لە دوکان دەدانا، کە پرسیمان ئەوە بۆ چییە عوسمان؟! بەدەم بورغیکردنەوەی پشتی ڕادیۆیەك لەبەر خۆیەوە دەیگوت: فەقەراتم هەیە و تاقەتی هەلگرتنی کەسم نییە، هەر سەگبابێك بێتە ئێرە با سوراحییەك بەنزین بخواتەوە، تا بەشی چوون و هاتنەوەی لای تەهای موزەمید بکا!

کەس نەما ئەو ڕۆژەی نوێژی ئیستیسقایان بۆ باران دەکرد لە

پێکەنیندا فرمێسکی وەکوو تاڤگە نەیەتە خوارەوە، کاتێك مەلا ساڵح لە پێشەوەی خەڵکەکە دوعای دەکرد:

- خودایە، بارانێکی بەخوورِ و زۆر، تا دنیا و وڵات و شار و دار و بەرد و ئینس و جن بشواتەوە، مەرکانەکان و تانکییەکان و جادەکان و ماڵەکان و حەوشەکان پرِ بکا..

خەڵکەکە هەر بابایە رِێی ماڵەویان گرت برِۆنەوە، مەلا ساڵح هاواری کرد: "بۆ کوێ ئیمانداران؟!"

عوسمان تەسجیلچی گوتی: دەچینەوە ماڵێ و دەرگا دادەخەین مەلا ساڵح، چونکە ئەوەی تۆ داوای دەکەیت باران نییە و تۆفانی نووحە!

کوران، بازارِێکی دووورودرێژی هەبوو، بۆنی سەوزە و لەنجەی ژنان و بانگەوازی فرۆشتن و قورِی سەر شەرواڵی دانان و هەڵگرتنەوە و کێشانی سەوزە و میوەکان، ئاژاوەی هەرزانفرۆشی و جنێوی دوکاندارەکان بە شاگردەکانیان و گریانی ئەو منداڵانەی عەبای دایکیان رِادەکێشا بۆ کرِینی تۆپ و یازدەی ئازار، دەنگی موکەبیرەی ئەو مەلایەی لەبەر کۆکین کەس نەیدەزانی کامە ئایەتە و تەقەتەقی ئەو پینەدۆزەی بەدەم ئیشەوە بەردەوام جنێوی بە ژنێك دەدا، کەس نەیدیبوو، بەڵام هەموو دەیانزانی ناوی خاسێ بوو.. ئەمانە هەمووی کەرنەڤاڵی

زیندوێتی بوون و شایەتییەکی فیزیایی بوون کە ئەم هەسارەی زەوییە لە ئەنجامی تەقینەوەی مەزنەوە بەرهەم هاتووە.

جۆگەلەی ناوەڕاستی بازاڕەکە کە تیایدا ئاوی باران و خوێنی قەسابخانەکان و فرمێسکی عاشقەکان و تاکە نەعلی ژنەکان و پارچە خەیارە تاڵەکان و تفی تفکردنەوەی گازی یەکەمی خەیارە تاڵەکان و میزی منداڵان و وەرەقەی یانەسیب و مووی سەرتاشخانەکان و تووکی سەر و قاچی ئەو مەڕ و بزنە بەستەزمانانەی تێدابوو، کە دەتگوت لە بنی بنەوەی جەهەننەم بە پرێمزی قیامەت بۆ بوونە سەروپێ سووتێنراون، لەگەڵ ئەوەشدا گەنجەکان بەرگەی ئەو بۆنە ناخۆشەی جۆگەلەکەیان دەگرت، چونکە کچۆڵە عەبا لەسەرە شەرمنەکانی ناچار دەکرد بۆ پەڕینەوە دامێنی کراسەکانیان هەڵکەن و پووزیان دەردەکەوت، ئەو پووزانەی لە زەردی و تووڕتیدا دەتگوت ئەو پسکویتە زەرد و ڕەقەیە کە خەڵکی گەڕەك ناچار بوون ماوەی شەش بۆ هەشت دەقە لەناو پەرداخی چادا بیخووسێنن تا بخورێت.

دەبووایە کافکا لەو گەڕەکە بووایە و تەماشایەکی ئەو بەرخەی کردبا کە بە پەتێکەوە بە دەرگای ئاسنی قەسابخانەکەدا بەستراوەتەوە و دایکیشی بە سەربڕاوی لەناو تەشتێکی شینی پڕ خوێندا زمانی دەرهێناوە و بە چاوی خێلەوە لە بەرخەکەی دەڕوانێت، بەرخەکەش لەگەڵ هەر دەنگێکی تیژکردنەوەی چەقۆیەکدا خۆی لە پەنا عەبای ژنە کڕیارێکدا دەشاردەوە. لەناو

ئەو هەموو پیسییەی دنیادا، خەڵکەکەی هێندە سادە و پاك بوون، باشترین پرسیاریان بەرامبەر گەردوون ئەوە بوو کە بۆچی زۆربەی ژنە جوانەکان ناویان ڕێزانە؟!

دەکرا خەڵکی ئەو گەڕەکە هەموویان ناویان ئیسماعیل بووایە، چونکە هەموو باوکەکان جێیان هێشتبوون، باوکە ئایینی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، بێجگە لە باوکێکی چەقۆ بە دەست هیچی تر نەبوون. لە شێوەی دوکانەکانی پارێزگای زیقار هەموو شتێکی تێدا دەفرۆشرا، وەکوو بازاڕەکانی مۆمبای هەموو شتێکی تێدا دەخورا، هەموو شتێکیشی تێدا دەگۆڕدرایەوە: پیاڵە بەرامبەر بە پیاز، سێ لوقم بەرامبەر بە دوو زانیاری سەبارەت بەو خێزانەی تازە هاتبوونە گەڕەك، جووتێك گۆرەوی بەرامبەر بە نووسینی نامەیەکی دڵداری، شریتێکی جەلال سەعید بەرامبەر بە سەرتاشینێك، هەردوو بەرگی بنەما سەرەتاییەکانی فەلسەفەی مارکس بەرامبەر بە هەردوو ڕۆمانی هەرەس و سەگوەڕی محەمەد موکری، نووشتەیەکی دڵ نەرمکردنی دۆستێك بەرامبەر بە دوو فڕەی پشت ماتۆڕێك، دەفتەرێکی پڕ شیعرە قەدەغەکانی پەشێو بەرامبەر بە پڕکردنی تانکیی ئاوی سەربان لە نوێژی سبەینە، مشتێك گوڵەبەڕۆژە بەرامبەر بە ڕەسمێکی نیوە ڕووت، دانیشتن لەسەر کورسییەکی لووس لووسبوو بە سمتی هەزاران و خواردنی دوو هەنار بەرامبەر بە ڕازیبوون لەسەر زەمکردنی دراوسێیەکی هاوبەش، نیو کیلۆ قیمەی قەسابخانەکەی ئادەم

جمهووری بەرامبەر بە گوێگرتن لە گەنجێك كە جەرگی کونکون بووبوو بە تیری عەشقێك.

لەو بازاڕەدا، چاوی جوانت دەبینی کەمێك لە ژێرپیاڵە هەنگوین گچکەتر، چاوت لەژێر عەینەکی زەڕەبینی بە پلاستەر بەستراو دەبینی هەندێك لە دەنکە نیسك گەورەتر. ژنت دەبینی جوانتر لە فستقەکانی دوکانی مام یەحیا مەسیفی، جەستەی لەڕ و دەندە و پەراسووی سواڵکەرەکانت دەبینی خراپتر لە جنێوەکانی خالید ئەبو شوارب، ڕووخساری شەرمنت دەبینی ناسکتر لە ترۆزییەکانی سەر گونیەی تەڕ، ڕووی قایمت دەبینی عەبووستر لە چەرمی پێڵاوەکانی دوکانی مام کەریم ڕۆژبەیانی. بە شاراوەیی کەشکۆڵی پێشمەرگەی شێرکۆ بێکەست دەبینی لەژێر گونیەی تەڕەپیاز، بە ئاشکرا جاشت دەبینی خەریکی بردنی میوەیە بێ پارەدان. نەك جیهان بەڵکوو مریشکە پۆپنەسوورەکانیش لە کونی زەمبیلەی ژنەکانەوە زمانیان لە دوکاندارەکان دەردەهێنا، کەسیش خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەچوو ئەو مریشکە فەقیرانە گەرمایانە.

بە داخەوە لە ئێستادا ئەو دەفتەری ئەعمالانەمان دەست ناکەوێ کە مەلایکەتەکان لەو زەمانە لەسەر شانی تۆزاویی ئەو خەڵکە تۆماریان کردووە، تازە دەبێ تا قیامەت چاوەڕێ بکەین، دەنا دەردەکەوت ئەم گەڕەکە چەند ئەیوبی تێدابوو سەبری گرتووە، دەردەکەوت ئەم گەڕەکە چەند یوسفی تێدابوو بێ

زوله‌یخا، چه‌ند یونس كه‌وتوونه‌ته ناو سكی حووته‌كانی وشكانییه‌وه، چه‌ند پیره‌مێرد بووكه‌كانیان له ماڵه‌وه ده‌ریان ده‌كردن و به ڕه‌شهه‌ڵگه‌ڕاوی له‌به‌رده‌م مزگه‌وته‌كاندا به‌ردی سیزیفیان له‌سه‌ر شان بوو و به نووزه له‌به‌ر خۆیانه‌وه ده‌یانگوت: ئه‌حه‌دون ئه‌حه‌د.

ئای له ئاوڕدانه‌وه‌ی منداڵانی گه‌ڕه‌ك به‌رامبه‌ر ئه‌و منداڵانه‌ی له‌گه‌ڵ دایكیان له گه‌ڕه‌كی موفتییه‌وه هاتبوون و بۆنی سابوونیان ڕۆژه‌ڕێیه‌ك ده‌ڕۆیشت، هه‌مان ئاوڕدانه‌وه‌ی سه‌گه له‌ڕولاوازه‌كانی گه‌ڕه‌ك بوو به‌رامبه‌ر به‌و سه‌گی زینه‌یه‌ی به قردێله‌یه‌كی په‌مه‌ییه‌وه له باوه‌شی منداڵه ده‌وڵه‌مه‌ندێك گرمۆڵه ببوو. ئه‌وه‌ی ئیشی كه‌م بوو ته‌نها عه‌بدوڵڵای حه‌لاق بوو، چونكه ڕۆژگاره‌كه هێنده ڕه‌ش بوو كه‌س پێویستی به ڕه‌شكردنه‌وه‌ی قژی نه‌بوو، هه‌رچه‌نده سبه‌ینه و عه‌سران دوكانه‌كه‌ی پڕ بوو له گه‌نجی تازه هه‌راشبوو، به‌ڵام عه‌بدوڵڵای حه‌لاق ته‌نها مه‌غریبان له كاتی دوكان داخستندا تێده‌گه‌یشت كه گه‌نجه‌كان بۆ سه‌رتاشین نا، بۆ دزینی لاپه‌ڕه‌یه‌كی نیوه‌ڕووتی ناو ئه‌و گۆڤاره عه‌ره‌بییانه هاتبوون كه بۆ موشته‌رییه خوێنده‌واره‌كانی دانابوو.

ئه‌وه‌ی له‌و گه‌ڕه‌كه‌دا نازیان هه‌ڵده‌گیرا شێته‌كان بوون، گله‌یه هه‌میشه‌ییه‌كانی مه‌لاكان و چوونه ته‌عزییه و ئه‌ركی دراوسێتی و پاڵه‌وانێتییه‌كانی شه‌ڕه گه‌ڕه‌ك و كوردایه‌تییان له كۆڵ بووبووه، خه‌ڵكه‌كه به چاوی به‌زه‌ییه‌وه لێیان ده‌ڕوانین،

خۆشبەختانە لەو گەڕەکە دوورەدەستە نەناسراوەی دنیای ئەوکات خەڵکەکەی هێشتا کۆجیتۆکەی دیکارتیان نەبیستبوو کە زۆر بێویژدانانە دەڵێت: "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم." بە واتایەکی تر ئەوەی بیر نەکاتەوە نییە، ئەمەش بۆ ماوەیەکی زۆر بووە بەهانەی دەسەڵات تا شێتەکان وەکوو نەبوو حسێب بکرێن و هیچ گرنگییەکیان پێ نەدرێت، تەنانەت لەگەڵ بکوژەکان و تاوانبارەکاندا زیندانی بکرێن.

خەڵکەکە سەرسامی ئەوە بوون کە شێتەکان هەرچییان دەهاتە سەر زار دەیانگوت و حسێبیان بۆ جاشەکان و ڕاپۆرتنووسەکانی دەزگا بەعسییەکان نەدەکرد، جار هەبوو کە شێتێك بە دڵی خۆی جنێوی بە دنیا و حکوومەت دەدا، وەك ئەوە وابوو تۆڵەی بێدەنگبوونی ناچاری ئەو خەڵکە بکاتەوە و دەیانگوت: لێی گەڕێن با بە دڵی خۆی جنێو بدا، چما ئێمە بە حیکمەت و ڕەوانبێژی هیچمان پێ کرا؟! خۆشەویسترین شێت، کەسێك بوو پێیان دەگوت "محەممەد ئاغا"، ئەو محەممەدە قەت دەستی نەدەشوشت، هەرچی دەخوارد و دەستی بە هەر شتێك کەوتبا دوکاندارەکان پێیان ناخۆش نەبوو، چونکە هەمیشە بە ڕستەی ناتەواو ئەوەی دەگێڕایەوە کە چۆن پێش ناشتن دەستی بە کفنی دایکی داهێناوە.

لەو قیامەتەدا لێکدژیت دەبینی لەنێوان شتی هاوبەش: مریشکفرۆشێك کە هەموو لەشی بە خوێنی ئەو پەلەوەرە بەستەزمانانە سوور بووبوو، کەچی لە خۆشەویستیی ئەو کۆتر و باڵندانەی لە سەربانیماڵەوەیان بەخێوی دەکردن، وەك ئاماژەیەك

بۆ حەزرەتی سولەیمان کە زمانی تەیروتاری دەزانی، لەسەر باسکی کوترابوو: سولەیمان. هاوبەشیت دەبینی لەنێوان شتی لێکدژ، گەنجێکی عارەقخۆر بە غار ئاگاداری گەنجێکی موسڵمانی فیراری عەسکەری دەکردەوە، دوو پارچە چەرچەفی دوکانێکی موغازەی دەدایە دەست و وەك ئەوەی باڵ بن، دەیگوت: بفڕە بەعسییەکان هاتن.

دوا ڕۆژی هەمووان خوار و تاریك بوو، ڕێکی و ڕووناکیت تەنها لە بریسکانەوەی سمێڵ و جلە جوان و هەمیشە ئوتووکراوەکانی مشیری موختار و ئاڵتوونەکانی واجیهەی دوکانەکەی شێرزاد بندیانی زێڕینگەردا دەدۆزیەوە. تەنانەت ئەو ئومێدانەش دەبوونە مایەی پێکەنین کە ژنە عەرەبە قەرەجەکان، سبەینان بە قەیماغی پڕ شیر و مرەبای قەیسیی ترشەوە دەهاتن و ناو لەپی خەڵکەکەیان دەخوێندەوە و هیوای شیرینیان دەبەخشییەوە، شیرینتر لە خورمای ئەو دارخورمایانەی لەسەر چەناگەیان کوترابوو کە بە کوردییەکی شڕوشەق دەیانگوت: دنیا زێن دەبێ زێن، سکت بەو خەڵکە دەسووتا کە نەدەکرا پرسیارە ئەزەلییەکەیان بۆ ئەو ژنە عەرەبانە تەرجوومە بکرێت کە ئاخۆ: کەی بەعس دەڕووخێت، ئاخر کەی؟!

لە ئێوارەی خانووەکاندا کە دیوارەکانیان خۆڵەمێشی بوو و هێشتا شتێکیان نەدەناسی بە ناوی بۆیاغ، دووکەڵی سیپەلاکی برژاو و وردە هێلکە و هێلکەدانی مریشکی سوور و کنگر بە ماسی و تەقینەوەی نۆکی ناو ڕۆنێکی داغبوو و قیژەی ئەو منداڵانەی بە پارچەیەك نانەوە بە دیاریەوە سڕەیان گرتبوو،

ئاسمانی دەتەنی و مانگی لە عاشقەکانی سەربان چلکن دەکرد، چلکن بە جۆرێك، بەو لیفکانەش پاك نەدەبۆوە کە کچەکان لەپێش دەرگا بەدەم باسکردنی خەنافسی درێژ و دەلینگی شارستۆنیی فراوانی کوڕەکانەوە دەیانچنی، ئەگەر ئیبن بەتووتە ڕێی کەوتبایە ئەو گەڕەکە کتێبێکی دەنووسی بە ناونیشانی: "توحفەی ڕامان فی غرائب کوران". سەدای نەبوونیی هێندە بەرز بوو، تەنانەت بە ئامۆژگارییە جوانەکانی شێخ سەلاحیش ئارام نەدەبۆوە. بێدەنگی ئەو کاتانە هەبوو کە ڕوومەتی بە زللە مۆر هەلگەڕاوی گەنجێکیان دەبینی جاشەکان شێلمی کولاویان لێ خواردووە و پارەیان نەداوە، یان ئەو کاتەی عەرەبێکی بەعسی بە قۆپچە گەورە دەرپەڕیوەکەی سەر ورگە زلەکەی کە دەتگوت سەد فلسییە و شێروخەتی بە چارەنووسی خەلکەکە دەکرد. ئەوسا ئەوەندەی چیرۆکەکانی عەشق لە سەربانەکان بوون هێندە لە کۆلانەکاندا نەبوو، بەوە دەتزانی لە هێمنیی نیوەڕۆی دوای لە نوێژ هاتنەوەدا ئەگەر لە تەسجیلێکی بە تێپ بەستراوی سەر سوکانی پایسکلی بێ قایشقوڕی گەنجێکەوە دەنگی ماملێ هاتبا: "سەر لەسەر ڕانی، تاکو بەیانی، بوومە میوانی نازەنینێ.." دەتبینی ئەوا هەر یەکە و تەماشای سەربانێك دەکا!

لەو گەڕەکە، زستانان، زیرەکیی دەویست جیاوازییەك لەنێوان فرمێسکی خەلکەکە و باراندا بدۆزیتەوە. هاوینان، زیرەکیی نەدەویست هاوبەشییەك لەنێوان بەفیڕۆچوونی تەمەن و ئەو ئارەقە

و گەردوتۆزە ببینیت کە وەك تەباشیر تێکەڵ بە ڕۆنی سەیارەی بەرازیلی بە لاجانگ و پشتەملیانەوە دەهاتە خوارەوە، جووڵە جووڵی قوڵینگەی جەمەدانییەکانیان دەیکردنە کەف.

ئەوسا لەو گەڕەکە خانووی سێ قات نەبوو، دەنا هەر کەسێك بچووبایەتە بەرزایی، وەکوو تەلیسکۆبی هابل، بەئاسانی دیاربوو چۆن ئەو خەڵکە دەڵێی نیشتەجێی هەسارەیەکی دیکەن و بە دەوری هەتاوێك نا، بە دەوری کولێرەیەکدا دەسوورێنەوە.

ئەگەر لە فرۆشیارەکانی ئەو بازاڕە وردبایتەوە، خۆیان لە هەموو کەس زیاتر پێویستیان بەوە هەبوو ببنە کڕیار. تاکوتەرا نەبێت، دەنا لە ماڵەکانیاندا قەنەفە و سیسەم و کەوەنتەر و تەسجیل نەبوو، جلوبەرگ و یاری بۆ منداڵەکانیان و پیاسە و سەفەر بۆ گەورەکانیان نەبوو. ڕەفەی هەندێ دوکان پڕ بوو لە شوکولاتە و منداڵەکانیان لە ماڵەوە تەنها قەسپی عەشرەسییان دەناسی! لە دیواری دوکانێکدا ڕەسمی ڕیکلامی ئەو پیاوە قۆزە سەر بە کلاوەی لەبەر ئاگردانێکدا جگەرەی مارلیبۆرۆی بە چیلکەیەك دادەگیرساند، بە خزمایەتییش نەدەچۆوە سەر ئەو کیسە تووتنەی وەکوو گونی سێیەم لەناو لینگی خاوەن دوکانەکەدا لە شێوەی پەندۆڵی کاتژمێرێکی ئەبەدی، دەهات و دەچوو!

لە سوعبەتێکی ناخۆشی قەدەر دەچوو کەسانێك دەبووایە کڕیار بن، ببوونە فرۆشیار. بە پێچەوانەی هەموو دنیا کە

کڕیارەکان چارەی فرۆشیارەکانیان ناوێ، لەو بازاڕەدا دوکاندارەکان ڕقیان لە موشتەرییەکان بوو، چونکە لەگەڵ کڕینی هەر شتێك دوکاندارەکان پێداویستیی ماڵەکانی خۆیانیان بیر دەهاتەوە، تەنانەت دوای مەغریبان لایەکی گەڕەك مەرایی و ماستاوییان بۆ کوڕە گەورە بلحەکەی نووری کارەباچی دەکرد تاوەکوو بە پلایزەکەی باوکییەوە گوێزی کۆن و پسکویتی ڕەقیان بۆ بشکێنێ.

لەگەڵ ئەوەی لە زاهیردا پەیوەندیی خەڵکی ئەو گەڕەکە زیاتر لەگەڵ کتێبە بەرگ فەیرووزییەکەی تەفسیری خەونەکان بوو، کە لە ڕێگەیەوە لێکدانەوەی هەموو خەونێکیان دەبردەوە سەر ئازادی و هێندە هیلاك و شەکەت بوون تیایدا خەونیان بە تێرخەوییەوە دەبینی، کەچی لە ڕاستیدا جێی شانازییان تێکستێکی مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی ئاڵی بەگی میکایەلی ناسراو بە (نالی) بوو کە دەڵێن کاتی خۆی لە ستایشی خەڵکی هەولێردا نووسیویەتی. ئەو قسانەی بەتەمەنەکانی گەڕەك لەبارەی ئەم تێکستەوە دەیانکرد، لەگەڵ گێڕانەوەکانی مەلا ناسیح حەیدەری یەکی دەگرتەوە کە لە پیشەکیی کتێبی دیوانی حەیدەریدا نووسیویەتی، شاعیری نازدار و ناوداری هەموو سەردەمەکان "مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلیی نالیی شارەزووری"، لە ساڵی ۱۸۲۱ زایینی لە سەروبەندی نۆژەنکردنەوەی خانەقای گەورەی هەولێردا ئامادە بووە، وەك

دەماودەم هاتووە ماوەیەك ماوەتەوە و شیعرێکی لە خۆشەویستیی هەولێردا نووسیوە، ئەو شیعرە لە لایەن دەوڵەمەندێکی زەمانی زوو بە ناوی عەبدوڵڵا نەنێ کە خاوەنی چەندین کوورەی خشت و کەرپووچ بووە لە کوران، پارێزراوە. دوای ئەوەی عەبدوڵڵا نەنێ دەمرێت و خێزانەکەی شوو بە ئاغایەکی دزەیی دەکات، هەرچی ماڵ و مولکی هەیە دەیفرۆشن، لە نێویشیاندا کوورەی خشتەکان، لەناو یەکێك لە ژوورە تاریکەکانی کوورەیەکدا ئەو شیعرە و چەند تاپۆیەکی عوسمانیش فڕێ دەدرێن و دەیدۆزنەوە و دەیدەنە دەستی باپیرە گەورەی مەلا مەعرووف، کە ئێستاش مزگەوتەکەی لەنزیك جادەی گەنمفرۆشان لە گەڕەکی کوراندا ماوە.

لە ڕاستیدا ئێستاش ساغ نەکرایەوە ئایا ئەو شیعرە هی نالییە یان نا؟! ئایا وشە و بەیتەکانی لە ڕێگەی "دەماودەمکردن"ەوە وەك خۆیان ماون یان نا؟ ئەو شیعرەی نالی لە هیچ کام لەو دەستنووسانەدا نین کە "نالی"یان نەسخ کردووە، نە چرووستانی و نە چنگیانی و نە عەلی موقبیل و نە کوردی و نە مەریوانی و نە گیوی موکریانی، پیرەمێردەکان دەیانگێڕایەوە چۆن کاتی خۆی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، فاتیحی کوڕی ناردۆتە کوران و شیعرەکەیان نەداوەتێ، عەبدولخالق مەعرووف هاتۆتە کوران و بەڵێنی داوە هەموو ڕادیۆ و تەسجیلەکانی ئەو

گەڕەکە بەخۆڕایی چاك بکاتەوە بەس شیعرەکەی بۆ بخوێننەوە و بێسوود بووە، مامۆستا گیو چۆن جنێوی داوە کە بە دەستبەتاڵی گەڕاوەتەوە. وێڕای هەژاری وکەمدەرامەتییان، دیارە ئەو شیعرەیان بە سامانێکی گەورە زانیوە، لەو شیعرەیش ئەوەی دەماودەم ماوەتەوە، ئەم چەند بەیتەیە:

**صەفحەی بەرینی سەهلی بۆ وەصفی ئەهلی ئەربیل**

**قەڵەمی منە عەینەن منارەی شەیخی جەلیل**

**شارێکە ڕیا کەمە بۆ مەکرەمە حاتەمە**

**شایەتی شەهرەزووری بوو بە ئەحسەنی دەلیل**

**موصەڵای سەر قەڵاتی بەرامبەر نەبی عوزێر**

**حازرە بۆ بەراتی مەرقەدی ئیمام تەعجیل**

**بەستۆرە نا لە چاوی من ئاو بۆ ئەوێ هاتووە**

**لە دەورەی تەواف دەکەن توحفەیەك نەیبێ مەثیل**

**هەم ئەهلی ئاسمانن هەم ڕەنگی خاکن خەلقی**

**پاکن لە میثلی کافوور تاکن لە جنسی ئەصیل**

**شەوقی بەتینی شەمسی کچانی ئەسمەر کردوون**

وەکوو پەنیری مەدبوغ چەشنی شەککەری حەلیل

پێشتر شێوەی قامەتت درێژ بوو ئەربائیلۆ

لەبەر کەمی ویصاڵت کورت بۆوە بووە ئەربیل

پیاسەی ئێوارانی یارانی هێندە خۆشن

حەیفە نەڵێی ما الدنیا الا متاع قەلیل

دەمگوت لەجێی چاومە نەبووایە قوصری نەزەر

ڕۆژانی دەف و تەطریب شەوانی زیکری طەویل

نالی لە هەولێر دەما نەیبا تەماعی جەننەت

سیدرەتی مونتەها لەکن سەیاحی پڕ ڕەحیل

ئەوەی لە هیچ سەرچاوەیەکیشدا باس نەکراوە ئەوەیە، پیرەژنەکان کاتی خۆی لە پیرەژنەکان و ئەوانیش لە پیرەژنەکانی زەمانی هەراشیی خۆیانیان بیستبوو، ژنێکی تورکمان هەبووە بە ناوی شەوقییە و ماڵیان لەسەر قەڵات بووە، لە مەجلیسی دانیشتنی لیفکەچنینەوەی بەردەم دەرگادا زۆر جار خۆی بەوە هەڵکێشاوە، گوایە دۆست و یاری مەلا خدری نالی بووە، ئەو ژنە هەمیشە دووبارە و دەبارەی کردۆتەوە چۆن نالی خۆش ویستووە، بە نازی شارییانەی خۆی دەیگوت:

- باجم ئالم قرلایدی.. ئۆ زامان چ وەچی موللا خدری نالی پیاسەیدەن جەلاردی قەلعەیە بیربیرمزە بەخاردخ، پێندر ئەلمە مهانەسیدەن سێلەشاردخ حەکەتلاری حەمسی شیعریدی ئەتەش دوشاردی جێولمە، بۆیی ئۆرتە، قەرە تووجلی، بیر شیرین بیر ئەدامیدی، جەمەدانی تاخماختە ئێربل خاخی چیمن دۆجیدی، حەتتە دییەسەن قەرە تووجلیاحتراملی جوزەل سێلەشاردی مانمنان یێلە ئیی حیس ئێترادری چی مەنە بیر تاج ئەروادەم ب دونیەدا.. خۆسگەم ئۆ زەمەنە مەلا خدر.[1]

بە داخەوە لەو شیعرەی گوایە بۆ ست شەوقییەی نووسیوە یەك تاقە بەیت ماوەتەوە و دوای نزیکەی سەدە و نیوێك مامۆستا ئەحمەد هەردی لەسەر نەزمی ئەم تاکە بەیتە، تێکستە شیعرییە نایاباکەی "ست فاتیمە" دەنووسێت:

**بووکی عالەمی خەیاڵم چاوەکەم ست شەوقییە**

**حوسنی خەلقی ئاوە ئەڕوا و جەمالی تۆ باقییە**

ئەو حەشاماتە وێڕای ئەوەی هەر یەکێکیان ناخیان لە خەفەتدا کون کون بووبوو، لەو کونانەوە نیشتیمانپەروەری و

---

[1] خوشکم، دەستم بشکێ لۆ ئەو زەمانەی تێیدا مەلا خدری نالی بە پیاسە دەهاتە سەر قەلاتێ و نیگامان دەگۆڕیەوە، بەناوی کڕینی پەنیر دەچوومە خوارێ و قسەمان دەکرد، قسەکانی هەموو شیعر بوون، ئاگریان لە دڵ و دەروون بەر دەدا، پیاوێکی ڕەشتاڵەی باڵامامناوەندی شیرین بوو، جەمەدانی بەستنی لە خەلکی ئێرە نەدەچوو، هەتا بڵێی بەڕێز و بە جوانی لەگەڵم دەدوا و ئەو هەستەی دەدامێ، تاقە ژنم لەو دنیایەی، یادت بەخێر مەلا خدر.

دڵسۆزی و مەردایەتییان لێ دەباری، ئەگەر بە پێچەوانەی ئاراستەی خۆر دیقەتی دەمی خەڵکەکەت بدایە، دەتبینی کاتێك وەڵامی پرسیارە سەرپێیەکانی پیاوانی ڕژێم دەدەنەوە، لەگەڵ هەر وشەیەکدا پڕوشکی وردە تف دێتە دەرەوە. ئیمانیان گەرمتر بوو لە گڕی ئەو پرێمزانەی سالاری مام یاسین چاکی دەکردنەوە. بەمیهرەبانیی ئەو کەسانەی لە هەژاری ڕاهاتوون، بەدەستی کورت و ناولەپی بە ئیش زبرییانەوە پارەی بە فرمێسك تەڕ و دیناری ئاسنی وەك ئەو سەردەمە ئاسنەیان بۆ فیشەك و ڕانکوچۆخەی مەناف و سەلام کۆ دەکردەوە، کە دوو پێشمەرگەی شۆڕشگێڕان و کۆمەڵە بوون، دواتر شەهید کران و بوونە سومبولی ئەو گەڕەکە خێر و سفرە پڕ لەخۆ نەدیوە. دوای شەهیدبوونیشیان بۆ ماوەی چل ڕۆژی تەواو، کەس دڵی نەهات لەو بازاڕە سرکەی هەنار و هەنگوین بفرۆشێت، چونکە دەیانگوت خوێنی شەهید مەناف کە ڕژا لە ئاوی هەنار دەچوو، ڕەنگی چاوەکانی شەهید سەلامیش هەنگوینیی بوون.

وەك دەگێڕنەوە: ئەم خەونی خۆشویستنی خاکەیان لە ڕاپەڕینی ساڵی نەوەد و یەکدا بووە ڕاستی، دەیانگوت، ئای لە هەڵپەی کوڕان و هەلهەلەی کچان و دوعای پیرەمێردەکان چ کەرنەڤاڵێکی ژیاندۆستی بوون، نەمانی بەعسییەکان و هاتنەوەی پێشمەرگە ڕێك دەتگوت گەڕانەوەی مووسایە بۆ ئەرزی میعاد، خەڵکی گەڕەك بۆ هێرشکردنە سەر بارەگاکانی بەعس لیمۆیان کردبووە ڕوممانە و خاکەناسیان کردبووە ڕم و ئەو چەقۆ

کورت و قەڵەمبڕانەیان کردبووە خەنجەر کە پەلکی زیادەی تەڕەپیاز و لاسکە ژەنگاوییەکانی دەسکە توورەکانیان پێ لێ دەکردەوە.. جەمەدانییان کردبووە پەت و بە ملوانکەی کچەکان دەست و قاچی پیاوەکانی ئەبو قائید و عەبدولڕەزاق مەرعییان دەبەستەوە، بە تەرازووی دوکانەکانیان خۆشییان دەپێوا و بە هۆی کەمیی ئاردەوە سینییە پێکەنینیان دەکردە خێر، بێ گوێدانە پاڕانەوەی ژنەکانیان، پیاوەکان پارچە نانی تیرییان لە ماڵەوە دەهێنا و بەسەر ئەو سەربازە داماوانەیان دابەش دەکرد کە دەتگوت ڕانە مەڕی بێ ساحێبن و بە کوڵانەکاندا پەرت دەبوون، ئەو کاتەی خەبەر هات کەرکووك ئازاد بووە، هەر بابایە نەوتی چرا و لەمپا و فانۆسەکانیان لە کۆڵان دەڕشت و بە کۆمەڵ حەزیان چووبووە بۆنی بابەگوڕگوڕ. تەنانەت کەسێکیان لە خۆشییاندا یەکدوو قومی خواردبۆوە و وەك ئەوەی بنی فانۆس بووبێتە پەرداخی گەورەی شەمپانیا و پێکی سەرکەوتن هەڵدا. تازە زانیبوویان بەرزکردنەوەی دوو پەنجە لەسەر شێوەی پیتی V ی ئینگلیزی واتا سەرکەوتن، هەر یەکە و لەجیاتیی سڵاوکردن دوو پەنجەی بەرز دەکردەوە، منداڵەکانیش وایان دەزانی ئیتر خەڵکەکە سەرکۆنەیان ناکەن لەسەر بەکارهێنانی دارلاستیك، بۆیە هەر منداڵە و لەجیاتی دوو پەنجە، دارلاستیکەکەی بەرز دەکردەوە.

بۆ ماوەی دوو ڕۆژ ئەو گەڕەکە یەکپارچە بووە مەیدانی سڵق، پەلك و لاسکی سڵق دنیای داپۆشیبوو، بەردەم دوکان و

بەردەم ماڵەکان و سەر شۆستە و جادەکان پڕ ببوون لە سڵقی لەتوپەتکراو، کە دەخەوتن لەجیاتیی دۆشەك سڵقییان ڕادەخست، کە هەڵدەستان لەجیاتیی لۆبیا و نۆکاو سڵقییان دەجووی، دوکاندارەکان لەجیاتیی گسك بە دەسکە سڵق مێشومەگەزیان لە میوە شیرینەکان دوور دەخستەوە، کچەکان لەبری کاغەز لەسەر سڵق وەڵامی نامەی عاشقەکانیان دەدایەوە، پیرەمێردەکان لەجیاتیی ڕەیحان پەلکە سڵقێکییان دەخستە گیرفانی کورتەکەکانییانەوە، پیرەژنەکان لەجیاتیی مێخەك لاسکە سڵقییان لە مل کردبوو، تەنانەت مامۆستاکانیش لەجیاتیی دار، بە دوو لاسکە سڵقەوە لە قوتابییەکانیان دەدا. هەتا ئەو کاتەی مەلا لە موکەبیرەی مزگەوتی گەڕەك هاواری کرد: خەڵکی خوا، ئیتر مەوزوعی وەتەنییەت و سڵقشکان و پەرتکردن کافییە، ئێمە بە داپۆشینی ئەو گەڕەکە بۆ ماوەی چل و هەشت سەعات، تۆڵەی خۆمان لە ڕەفیق حزبییەکان کردەوە. ئەوجا تێگەیشتین ڕەنگی کەسکە تێرەکەی سڵقی فەقیر هەمان ڕەنگی جلە کەسکە تێرەکەی بەعسییەکانە و پاش ئەو هەموو ساڵەی بایکۆتکردن ئیتر بۆ هەتاهەتایە خەڵکەکە لەگەڵ ڕەنگی کەسکی تێر ئاشت بوونەوە.

ئەو خەونە خۆشە لەمێژینەیەی ئازادیی خاك و نیشتیمان ساڵێکی نەبرد بووە کابووس، ئەو پەلکە زێڕینەی عەبدوڵڵا گۆرانی شاعیر دوای بارانێکی زۆر چەمابۆوە بەرامبەر بە خۆر،

پارچە پارچە کرا و هەر ڕەنگەی تاقمێك بردی، کەتافە لەبەرەکان کە تازە لە نەبوونی گەڕابوونەوە، قڕیان بۆیاخ کرد و ژنە کۆنەکانیان تەڵاق دا و هەرچی ناوی ڕێژان بوو مارەیان کرد. بۆینباخیان لەسەر شێوەی مەجلیسی تەنفیزی و تەشریعی بەست و هەرچی فافۆن و ئاسن هەبوو بە مەبەستی ئاودیوکردن کۆیان کردەوە، سەرەتا بە شۆفەڵ و حەفارە و دەمبەرەکان دەستیان پێ کرد، کە تەل و عامودی کارەبا بێ کارەباکان نەمان، ئیتر گەیشتنە گەڕەکە خێر لەخۆنەدیوەکەی ئێمەش، بە ناوی کوردایەتییەوە ئەو قاپە فافۆنانەیان لە منداڵەکانمان سەند کە لە سرەی ساوار کولاندندا وەستابوون و کیلۆی ئاسن و تەرازووەکانیان بردین، چەند گوناح بوون ئەو ژنانەی لەبەر دزینی کیلۆ و تەرازووەکانیان ناچار بوون بە پێ میوە بۆ کڕیارەکان بکێشن! فەقیرانە لە شەرمان سوور هەڵدەگەڕان کە کڕیارەکان لەگەڵ بەرزکردنەوەی قاچیاندا تەماشای ڕان و پووزیان دەکردن، چەند گوناح بوون ئەو باوکانەی دەبووایە بە دزی سەربۆیاخکراوەکانەوە وەکو ڕۆژانەی چوونە مەکتەب وردەی پارەی ئاسن بدەنە منداڵەکانیان! تەنانەت ئەو پلایزەشیان لە نووریی کارەباچی سەند کە ئێواران بۆ منداڵە بچووکە مەغۆلەکەی گوێزی پێ دەشکاند و دەیهاڕی و بە میهرەبانیی باوکی نوقسانێکەوە لە دەمی دەنا. قوفڵی دەڕابی دوکانەکانیان بردین و بەڵێنی شۆڕشگێڕانەیان پێ داین کە ئیتر دنیا ئارامە و پێویستمان بە قوفڵدانی دوکانەکان نییە، ئاودیوی ئێرانیان دەکرد.

و دوای دوو هەفتە شێوەی کونی قوفڵەکانمان و جێپەنجەی مۆرهەڵگەڕاوی خۆمانمان بەسەر سۆندە و مەسینەی ئێرانییەوە دەبینییەوە.

ئاسن ئاودیو دەکرا و لاستیك دەهاتەوە، ئەو لاستیکانەی بۆنی پەڕۆی ترشاوی سەر مەنجەڵە ماستەکانی بەر هەتاویان دەدا. بزماری لانکی ساواکانی ئێمەیان لێ دەکردەوە و نەعلی سەوز و زەرد دەهاتنەوە، تەنەکەی حاوییەکانی زبڵیان دەبرد و لاستیکی دار لاستیك دەهاتەوە، ئەو شۆڕشگێڕە سەر تازە بۆیاخکراوانە ڕێوڕەسمی فێستیڤاڵی بەرهەمی خۆماڵییان لە بازاڕەکەی کوراندا ڕێك خست و گوتیان دوو ڕۆژی دیکە سەرکردەکانمان دێنە ئێرە. لەپێناو ڕازیکردنییان، دار و درەختی نایلۆنیان لە ئینجانەی گەورە گەورە هێنا و لەپێش دوکانەکاندا بە بورغی چەقاندیان، محەمەد ئاغای شێتە خۆشەویستەکەی هەمووانیان بە دیتۆل شوشت، سەگە لەڕولاوازەکانی بازاڕییان دەرکرد و سەگی جوان و بە قردێلە لە ملیان لە شوێنیان دانا، مریشکە قووندە و بێکلکەکانی ئێمەیان سەربڕی و مریشکی قەڵەو و تەنگەئەستووریان خستە ناو قەفەسی مریشکفرۆشەکانەوە، ئەو پشیلانەیان دەرمان خوارد کرد کە خۆیان بە قاچی کڕیارەکانەوە هەڵدەسووی و پشیلەی چاو عەسەلییان هێنا وەکوو چاوەکانی ڕێزان، هەندێك میزەڵدانی زەرد و سەوز و شین و مۆریان هێنا و ناچارییان کردین بە ئاهی بەسەرابیوونی خەونەکانمان پڕیان بکەین و لەمبەر و لەوبەری دوکانەکاندا هەڵیانواسی.

یەکدوو ڕەسمی گەورەی چەند سەرکردەیەکی شەهیدی خۆیان بە دیوارەکاندا شۆڕ کردەوە کە ئەگەر لە سەردەمێکی تر بووایە خەڵکەکە کڕنۆشیان بۆ دەبردن، کەچی ئێستا دەیانزانی باشترین چاکە کە شۆڕشگێڕ بیکات ئەوەیە پێش وەرگرتنی دەسەڵات شەهید بێت، پیاوەتییەکی گەورەیە کەسی شۆڕشگێڕ بکوژرێت پێش ئەوەی کافیار بخوات و باڵنتاین بخواتەوە و ژنێکی سی ساڵ لە خۆی بچووکتر بهێنێ و سەر و لاجانگ و گوێی لە بۆیاخی پێڵاو هەڵسوێ، چونکە ئەو بازارەش بێجگە لە تەماتەی پلیشاو و پیازی سەر ژەنگاوی و باینجانی تەپەدۆرانە و گندۆرەی لاقوزە و دۆشاوی تەماتەی سینییە تەماتە وشککراوەکانی سەربانەکانی گەڕەك، هیچی دیکەی لێ نەبوو، هاتن، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ڕاپەڕین بۆتە مایەی خۆشگوزەرانی، بە ماددەی پۆلستارین هەناری گەشاوە و تەماتەی تورت و لیمۆی ڕەنگ زێڕینیان دروست کرد، بە جێبە بێرەقەمەکانیان حەوزی پڕ ماسییان دەهێنا و دایاندەنا، قوتووی لازانیا و قوتووی حومس بە تەحین و بابەغەنوجیان لە ڕەفەکاندا ڕیز دەکرد، کارتۆنی سپاگێتیی ئێرانی و کارتۆنی هێلکەی تورکی لە دوورەوە دەبریسکانەوە، دوکان و ڕەفەکانیان پڕ کرد لەو شتانەی ناویشمان نەدەزانی، پێش دەستپێکردنی فێستیڤاڵەکە دوکاندارەکانیان لە پشتەوەی دوکانەکاندا بەستەوە، ئەوەش چونکە بە ڕای نیشتیمانپەروەرانەی خۆیان چرچاوی ئێمە بە کەڵکی بەردەم کامێرا نایەت، حیمایەکانی خۆیانیان کردە

دوکاندار، گوتیان نیو سەعاتێکە و تاوەکوو سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی نانی نیوەڕۆیان بۆ بخورێت و سفتاح بە پەراسووی دیاری سینگی ئێوە نەکەنەوە، ئەو کاتەی سەرکردەکان تەشریفیان هێنا هەستمان کرد بۆچی بەشە خۆراکی مانگانەمان نەماوە، چونکە تازە خەریك بوون بە برنجی بایەعیمان سووکە ورگێك لە سەرووی دەمانچەی تاریقی کەمەریاندا بونیاد بنێن، ئێمە بە دەمبەستراوی لە پشتەوەی دوکانەکاندا زەندەقمان لەوە چووبوو یەکێك لەو سەرکردانە هەر بۆ تاقیکردنەوە گازێك لەو پرتەقاڵ و لیمۆ دار و تەختانە بگرن و ڕیزی سەرەوە و خوارەوەی ددانیان بشکێ.

دوای ئەوەی ئاسن و فافۆن نەمان، بزمارە ڕەشە بچووکەکانی کەوشی پیرەمێردەکانیان لێ کردەوە، چەرخە ستیلە فتیلدارەکانی ناو باولی پیرەژنەکانیشیان برد و ئاودیویان کرد، ئەوجا هاتنە سەر خەڵك، ئەوانەی لەگەڵ جۆرە کوردایەتییەکەی خۆیان نەدەگونجان، بە منداڵ و پیرەوە، ڕەبی کەما خەلەقتەنی خێزانەکانیان لەو زیلە عەسکەرییە سەر بەقوڕانە دەئاخنی کە لە سەربازگەکانی بەعسدا بە میراتی بۆیان جێ هێڵدرابوو، شاربەدەریان دەکردن، لە سلێمانییەوە بۆ ئەودیو دێگەڵە و لە هەولێرەوە بۆ ئەمدیو دێگەڵە، ئای لەو منداڵە جوانانەی لە سلێمانی دەرکرابوون و لە بازاڕی کوراندا بە شەرمەوە دەیانگوت کاڵەك و هێشتا فێری ناوی گندۆرە نەبووبوون، بە

خاسیان دەگوت کاهوو، بە ناوسێرییان دەگوت نانساجی. جەرگت دەبووە ئاو بۆ ئەو شێتە بەستەزمانەی کوران کە ئاوارەی سلێمانی کرابوو، بیستمان لە ناوەندی سەرا و بازاڕی عەسریدا بە پێی پەتی و دۆخینی شۆڕی شەرواڵە دڕاوەکەیەوە پرسیاری قەڵا و منارەی لە خەڵکەکە دەکرد. ئای لە مەراقی ئەو گەنجە هەولێرییانەی لە گەڕەکی ئیبراهیم پاشادا بە شوێن کۆڵانەکانی گەڕەکی نەسیجدا دەگەڕان و بە مامەیارە گردی کللك مشکیان بیر دەهاتەوە، ئای لە خەفەتی ئەو پیرێژنە سلێمانییانەی لە قسەی دراوسێ هەولێرییەکیدا نەیبیست کەس بڵێت: بەساقەو بم.

لەو ساتەوە زمانمان نەما و وردەوردەش لە دەمی شارەکاندا ئەپارتمانی شۆڕشگێڕەکان بوونە کەڵبە، ئیتر بەسەرچوو ڕۆژگاری ئەو دڵانەی بە دروشمێك چاك دەبوونەوە، بە سروودێك پاك دەبوونەوە.

خێزانی ئەو نووسەرە نەناسراوەمان، لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە لەوێدا دوکانی میوەجاتیان هەبوو. دایکی لەسەر دوکانەکە بوو، "زێڕێ" بە کراسێکی بەرباخەڵی ڕەشەوە بەرگری لە سپێتیی بەرەبەیانان دەکرد، هەمیشە هێشووە ترێیەکی شۆراوەی حازری هەبوو تا یەکدوو قل بخاتە دەمی وشکبووی ئەو منداڵەی لەو بازاڕە لە دایکی بزر دەبوو، بە دوو دەنکە خورما خوێتی بۆ ڕووخساری

سپیهەڵگەڕاوی ئەو منداڵانە دەگەڕاندەوە کە دایکیان بۆ گرتنی وێنەی چوونە مەکتەب بە دوو چەپۆك لەبەردەم پیاوە ترسناکەکەی ناو پەردە ڕەشەکەی ڕەسمی شەمسی دایاندەنیشاندن و بە تف کاکۆڵیان تەڕ دەکردن و بە دەنگ و بریسکانەوەی مەگنیسیۆمی کامێرا سێ پایەکە زەندەقیان ڕژابوو. بەردەوام دوو پەچەی لەسەر بوو، یەکێك بۆ یەدەگ، نەوەك کچۆڵەیەك بە تەعلیقی گەرمی پیاوەکان سوور بێتەوە.

زێرێ، ژنێکی ڕەشتاڵەی باڵا مامناوەند بوو، پێستە ئەسمەرەکەی لەو نانە بۆرانە دەچوو کە ئەوسا خەڵکی گەڕەك بۆ خێزانە بارزانییە ئاوارەکانی قوشتەپە کۆیان دەکردەوە. لەسەر کرکراگەی پەنجەی شایەتمانەی بە گەنجی خاڵێکی کوتابوو هێندە بچووك بوو، دەکرا وەك بەڵگەیەکی تاتۆی شەرمنیی ژنانی سەرەتای سەدەی ڕابردوو توێژینەوی لەسەر بکرێت. وەك نزیکبوونەوەیەکی مەعنەوییش لە بەگزادەکان، لە مەردایەتیی ئاغایەکی دزەیی ناوی لە یەکێك لە کوڕەکانی نابوو: تەڵعەت. کەس نەیبیست داوای دوعایەك بۆ خۆی لە کەس بکات، تەنها دوعای بۆ منداڵەکانی دەکرد. دواتر بیسترا کە تاکە دوعای بۆ خۆی ئەوە بووە لە هەمان تەمەنی پێغەمبەری موسڵماناندا بمرێت کە بە تەسبیحە سوورە هەنارییە تۆخەکەی ڕۆژانە سەدان جار هانای بۆ دەبرد، ڕاستییش هەر لە تەمەنی ئەودا و لە شەست و سێ ساڵیدا لەناو ژیانە تاڵەکەیدا بە نەخۆشیی شەکرە مرد. کەس نازانێت لە چ مەلایەکی بیستبوو هەر کەسە و لە بەهەشتدا

دەچێتەوە سەر کارەکەی خۆی، بە پێکەنینەوە دەیگوت: لەوێش دەبمەوە میوەفرۆش و هەنجیر دەدەمە مەلائیکەتەکان تا بە پرسیاری شیرین حەشری ئەولادەکانم بکرێت. بە ئاهی سارد دەروونی ببووە موجەمیدە، کەچی بەبێ نانی گەرم نەدەگەڕایەوە. لە دوکانێکی ڕوکندا کە سێ لای بە ڕووی سەرمادا کراوە بوو، بە قەمسەڵەیەکی شینی لەماعەوە خۆی گرمۆڵە دەکرد و بە هەتاوی دوارۆژی زیرەکیی کوڕە گەورەکەی کە دەبووە ئەندازیار، خۆی گەرم دەکردەوە. سمڵ و مێخەکی سەرسینگی و ئەو دوو چڵە ڕەیحانەیەی دەیخستە پشت گوێی چەپییەوە تێکەڵ بە هەڵمی شێلمی سەر عەرەبانەکەی تەنیشتی دەبوو و بەیەکەوە بۆنێکی دەدا کە نزیك بوو لە بۆنی کتێبی کۆن. جۆری ئەو میوانەی دەشوشتەوە کە جووینیان ناوێت بۆ ئەو حاجییە زۆر پیرەی عەسران بە هەنگاوی هێواشەوە دەهات، دەهات و تووشی لەبیرچوونەوەش ببوو، هەموو خەڵکی، بە مەلای گەڕەکیشەوە بەناوی ئەو ژنە بانگ دەکرد کە کاتی خۆی خۆشی دەویست، ئەو حاجییە هەر کێ سەلامی کردبا، گەر پیاویش با، لەبەرخۆیەوە بە نووزەیەکی نزم، زۆر نزم.. دەیگوت: بەخێرهاتی هەمین.

لە ڕێی دەستنووسەکانی سەرمێزی ئەو نووسەرەمانەوە دیارە، کە بە هۆی ئەم دایکەیەوە ویستوویەتی ببێتە نووسەر، وەك خۆی دەڵێت جار جارە لەجیاتیی برا بچووکەکەی بۆ ئەوەی تێر خەو بێت، سبەینان زوو دەچووە گومرگ و سەوزە و میوەکانی

دەکڕی، دایکی بۆ هەموو میوەکان دەیگوت ئاگادار بە، تەنها بۆ باینجان کە لەسەر شانییەوە بە گونیە فڕیی دەدا، قسەی نەدەکرد. دەیگوت: کوڕم ئاگاداری ترێیەکە بە هەڵنەوەڕێ، بابە ئاگاداری پرتەقاڵەکە بە نەگوێێ، بەڵام قەت بۆ باینجان قسەی نەدەکرد.

زێڕێ پەڕۆیەکی خامەی سپی هەبوو، هەموو میوەکانی دەسڕیەوە و لە واجیهەی دوکانەکە بە ڕیز دایدەنان، کەچی باینجان لە سووچێکی دوکان بێناز کەوتبوو، گونیەیەکی وشکی بەسەردا درابوو، ئەو نووسەرەمان بە دزیی دایکییەوە خامە سپییەکەی دەهێنا و باینجانەکانی خاوێن دەکردەوە، لە تۆڵەی میوە بەنازەکانەوە، لە تۆڵەی سێو و پرتەقاڵ و خۆشداکەنەوە بە هەستی منداڵانەی، باینجانی خۆش دەویست. هەستی دەکرد لەنێوان سەوزە و میوەکانیشدا زوڵمی چینایەتی هەیە، بەشێکیان وەکوو دیاری دەبرێنە لای نەخۆش و لە میوانداریدا مەجلیسی پێ دەڕازێننەوە، هەندێکیشیان وەکوو ئەوەی هێتیمی بێدەرەتان بن لەناو ڕۆنی قرچاودا ئەمدیو و ئەودیو دەکرێن. هەستی دەکرد باینجان زۆر لەو دەچێت: پەراوێز و تەنیا، هێندە گوناح بوو قەت نەدەکەوتە واجیهەی دوکانەوە. ئەویش منداڵێکی پەراوێز و تەنیا، هێندە گوناح بوو قەت نەدەکەوتە واجیهەی دنیاوە. هەر بۆیەش خۆی لە پەراوێزێکدا گوتەنی: وەکوو یەکەم گەمژەی ئەدەبیات، یەکەم تێکستی خۆی لەبارەی باینجانەوە نووسی.

بەڵام، نووسەر پێش وادەی مردنی، کە پیر ببوو تەنها لەگەڵ

خوشکێکی دەژیا کە بە هۆی بەخێوکردن و چاودێریکردنی باوکیانەوە مێردی نەکردبوو. جەمیلە لە دارەتی دنیا چیرۆکێکی خۆشەویستی شك نەبرد، لەو ولاتەی شەمەندەفەری تێدا نەبوو، پێیان دەگوت شەمەندەفەرەکە جێی هێشتووی. سبەینە و ئێوارە بە زەمبیلەیەکی پڕ و دڵێکی بەتاڵەوە لە بازاڕ دەگەڕایەوە، وەك ئەوەی قەرەبووی بەختە سووتاوەکەی بکاتەوە کەس نەیبیست ڕۆژێك لە ڕۆژان چێشتێکی بسووتێت. هەموومان ئەوسا و ئێستاش دەتوانین لەبری ئەو سوێند بخۆین لە ژیانیدا نامەیەکی دڵداری نەخوێندۆتەوە، بۆ جارێکیش چییە لە باوەش نەکرا و نێرینەکان سلاوێکی ماناداریان پێ ڕەوا نەبینی، زۆر بەخێرایی و بەتوندی هەویری دەشێلا تاوەکوو لە شێوەی ئەو ڕۆژگارەی ئەوی برژاندبوو، نانەکەی باش ببرژێت. تەنها ئیرەیی بە منداڵەکان دەبرد دەیانتوانی بە قوڕی سناعی بەو شێوەیەی خۆیان دەیانەوێت هاودەم و ئازیزێك دروست بکەن. لە دوورەوە حەزی لە گوپە خرپنەکانی زیاد ئەسعەد و تەسبیحە قەزوانەکەی دەستی هونەرمەند ئاسۆی عومەر سوارە دەکرد. لەنزیك مێژی برا نووسەرەکەیەوە، بەدیار ئوتوویەکی ژەنگاوییەوە ڕۆژەکانی بەسەر دەبرد، تاوەکوو بە هۆی ئەو ئوتووەوە لۆچەکانی نێوچەوانی باوکی و لاملی و گەردنی خۆی بیربچێتەوە.

ئەو نووسەرە لە کۆتایی ژیانیدا، بەپێی شایەتیی خوشکەکەی، ڕۆژانە هەم نەخۆشتر و هەم بۆنخۆشتر دەبوو، لەبەر خۆیەوە ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر گۆرانی دەگوت و زیاتر دەکۆکی، براکانی

دەهاتن یارمەتییان دەدا و مانگانە مەسرەفی ماڵەکەیان دەکرد، جار جارە داوای یەك پاقلاوەی دەکرد، ئەویش جۆرێك بوو دیارە سبەینەك لە سبەینەکانی ئەو کاتەی هێشتا تووشی شەکرە نەهاتبوو لە ماڵی ئەو ژنەی خاوەن دەفتەرەکە خواردبووی، دەنا تەنیا لەناو دەفتەرە بۆنخۆشەکەی بەردەمیدا دەژیا. چیتر سەرقاڵی ئاشتکردنەوەی ئیمامی غەزالی و کارڵ مارکس نەبوو، تەنها کاری ئەوە بوو لە ڕێی وشەکانییەوە لێ نەگەڕێت خاوەنە جوانەکەی ئەو دەفتەرە پیر ببێت.

دەستی لەوە شۆردبوو مەحوی و لینین بە مانێفێستێك ئایدیایەکی تازە بۆ یەکسانی و بەیەکەوەبوون بدۆزنەوە، بە تەما نەبوو چیتر خەم لە ئاشتکردنەوەی عەبدولخالق مەعروف و کوڕەکانی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بخوات. حاجی تۆفیقی پیرەمێرد و کۆنفۆشیۆس بەیەکەوە ڕۆژنامەیەك دەرکەن. مەولەوی و بۆدلێر تێکستێکی هاوبەش بنووسن. نالی لە مەککەوە چامەیەك بۆ هەولێریش بنێرێت..

تاکە خەمی ڕازیکردنی ئەو خاوەن دەفتەرە بوو، کە دیاربوو زۆر لەمێژە بەڵێنی پێ داوە تەنها و تەنها بۆ ئەو بنووسێت. ئەو کەسەی هێندە خۆش ویستووە خۆی گوتەنی جار هەبووە بە نامەیەکی "بەیانیت باش"، لە خۆشییاندا دوو جار نانی بەیانی خواردووە لەبەر ئەوەی بیری چووە ژەمی یەکەمی خواردووە یان نا؟!

بەداخەوە هەر ئەو ژنەش، هەر خاوەنی ئەو دەفتەرەش، بەبێ ئەنقەست بوو بە هۆکاری مردنی ئەو نووسەرەمان. بەپێی ڕاپۆرتە ئەدەبییەکان کە دواتر لەبەر چەند پاساوێکی جوانناسی بڵاو نەکرانەوە، دەرچوو خاوەنی ئەو دەفتەرە، زۆر پێشتر شووشە عەترێکی بە ناوی Stronger With You بە دیاری پێ دابوو، عەترەکەش بێ ئەوەی خاوەن دەفتەرەکە بزانێت، کۆپی بووە و لە لایەن مێردەکەیەوە کە بازرگانێکی تازە هەڵتۆقیوی دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەیە خراوەتە بازاڕەوە. لە خۆشەویستیی ئەودا نووسەر بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو عەترە هەڵدەگرێت و دڵنیایە بەکاری بهێنێت. دوای ماوەی بەسەرچوون، وەك دەڵێن گوایە عەترەکە بەکارلێکەری مادەی میسانۆل کە تێکەڵەیەکی هایدرۆکاربۆنییە، ژەهراوی دەبێت. لە کاتی نووسیندا شووشەی عەترەکەی بە تەواوی لە لاپەڕەکانی دەفتەرەکە بەتاڵ کردبووەوە. ڕۆژانە بۆ ئیلهاموەرگرتن عەترەکەی بە لاپەڕەکاندا پرژاندبوو..

لە شێوەی پاڵەوانی ڕۆمانی (ناوی گوڵ)ی ئەمبرتۆ ئیکۆ، نووسەر لە کاتی هەڵدانەوە و ئاودیوکردنی لاپەڕەکانی دەفتەرەکە، پەنجەی بە زمان تەڕ کردووە و لەو ڕێگەیەوە وردەوردە ژەهرەکە چۆتە لەشیەوە.

دەرکەوت، خاوەنی ئەو دەفتەرە بۆنخۆشە: لە یەك کاتدا هۆکاری ژیان و مردنی بووە.

ئێمە، وەك هاوڕێیانی نووسەر، هێشتا نازانین ئەم دەفتەرە خاوەنەکەی کێیە و بۆ کێ نووسراوە؟! دەنا بەوپەڕی ئەمانەتەوە دەماندایەوە دەستی، زۆریشمان پرسیار کرد ئاخۆ لای کەس ناوی ئەو کەسەی درکاندووە کە خۆشی دەوێت یان نا؟ وەڵاممان دەست نەکەوت و هەر بۆیەشە ئەم دەفتەرە بڵاو دەکەینەوە، چونکە تا ئێستا ناو و ناونیشانی ئەو کەسە دیار نییە. ئێستاش با ئەو کەسە وەکوو ئێمەمانان ئەم دەفتەرە بخوێنێتەوە.

ڕەنگی بەرگی دەفتەرەکە شینێکی پیرۆزەییە، لەسەر بەرگەکەی بە خەتێکی گەورە و جوان نووسراوە "**لە ٦٣ ساڵیدا دەمرم**"، پێ دەچێ هەر خۆی ئەوەی دانابێ کە ئەمە دوا دەفتەرە پڕی دەکاتەوە. شتێکی تریش لەم دەفتەرەدا مایەی سەرنجە، ئەویش ئەوەیە کە لە نێوان بابەتەکاندا چەندین وێنەی هێڵکاریی جوانی کێشاون، بەمەدا دەردەکەوێ کە دەستی نیگارکێشانیشی هەبووە و ئەوەی بۆی نەخراوەتە ناو چوارچێوەی وشەوە، بە مۆتیف دەریبڕیوە، لەوانەیە ئەم دەفتەرە لە کۆی دەفتەرەکانی پێشووتری گرنگتر و خەمناکتر بێت..

ئەوە دەفتەرەکە و ئێوە و ئەو کەسەیش بۆی نووسراوە، فەرموون وەکوو ئێمە بیخوێننەوە..

# لەگەڵ تۆدا بەهێزترم

نازانم ئەمە دەفتەری چەندەمە لەبارەی خۆم و خۆتەوە پڕ دەبێت لە وشە؟ دەفتەری ئەمجارەتم زۆر بە دڵ بوو، شینێکی پیرۆزەیی. لە نقێمی ئەو ئەنگوستیلانە دەچوو لەبەردەم مەرقەدی ئیمامی عەلی لە نەجەف، پیرەژنە عەبا بەسەرەکان، ئەوانەی دارخورمایەکی بچووکیان لەسەر چەناگە کوتیوە، دایانناوە بۆ فرۆشتن، خەڵکیش بۆ ڕزق و چاکبوونەوەی نەخۆش و خۆپاراستن لە چاوپیسی و نەرمکردنەوەی دڵی یارەکانیان دەیکڕن. شین وەکوو بەرگی نەخشداری کتێبەکانی تەفسیرکردنی خەون. شین وەکوو ئەو ئاسمانەی دڵخۆشم هەردووکمان لە یەك سەردەمدا لەژێریدا زیندووین، وەکوو ئەو دووسەد و پەنجا دیناریەی دەدرێتە منداڵێکی بێ باوك و بە غار دەچێت مژمژەیەك بکڕێت و لە ڕێگادا لە خۆشییان هەڵدەبەزێتەوە، شین وەکوو بەرگی دیوانەکەی نالی.

ڕۆژانە لەگەڵ نووسیندا پرژەیەك لەو عەترەی پێدا دەکەم کە لە سەرەتای ناسیندا بۆت ڕەوانە کردم، بۆنێکە دەمباتەوە غەریبیکردنی ئەو منداڵەی لە سوجدەی نوێژدا زۆر دەمایەوە و سەری زۆر درەنگ هەڵدەبڕی، چونکە بۆنی مێخەکی سەر سینگی دایکی لە بەرماڵەکە دەهات.

لە یادەوەریماندا هەر مرۆڤە و ڕەنگێگی هەیە، هەیە ڕوون و هەیە تاریك، لە یادەوەریی مندا ڕەنگی تۆ شینێکی تۆخە، لەوانەیە هی ئەوە بێت کە هەمیشە حەزم کردووە لەناو کەشتییەکەی نووحدا و لەو تۆفانەی هەتا چاو بڕی دەکرد شینیی ئاو بوو، تەنها باپیرە هەرە هەرە هەرە گەورەکەی تۆ دەربازی بووایە، تۆش سالانە وەکوو مریەمی پاکیزە بە نووری ئاسمان دووگیان ببایت و دانیشتووانی ئەم هەسارەیە هەموویان ڕەچەڵەکی تۆ بن. شینێکی تۆخیت، وەکوو پەنجەی ئەو باوکەی لە کرێکاریدا بە چەکوش شین بۆتەوە، کەچی ئەو دەستەی دەخاتە گیرفانییەوە تاوەکوو منداڵەکانی نەیبینن و خەفەت بخۆن، لە هەیوانەکە بە دەستە ساغەکەی عەلاگەی میوەکە دەداتە دەستی ژنەکەی. شینێکی تۆخیت، لە شێوەی گڕە شینەکەی لەحیمی زێڕینگەرێك کە ئەڵقەی هاوسەرگیری بۆ دوو عاشق دروست دەکا.

من تەنها بۆ تۆ دێمە دەرەوەی خۆم و خۆم نیشان دەدەم، دەنا ئینسان بوونەوەرێکی تەنیایە و لە کۆتاییشدا هەر تەنیا دەمێنێتەوە و هەموو کەس شایەن نییە خۆتی نیشان بدەیت.

لە لەحزەیەکدا هەمووان جێت دەهێڵن و تەنیا دەمێنیتەوە. ئەمە دوارۆژی هەموومانە.

ژیانم وەکوو ئەو مەجلیسە دێتە بەرچاو، باپیرەکە لەگیانەلادابوو، ڕۆحی دەدا و لە دوایین نەفەسەکانی لەم دنیا فانیەدا بەهەدەر دەدا، کەچی منداڵ و نەوەکانی سەرقاڵی دابەشکردنی میراتییەکەی بوون. هەموو شتێکیان لەنێوان خۆیاندا

دابەش کرد و تەنها مردنەکەیان بۆ خۆی جێ هێشت. لە برایانی کارامازۆڤی دیستۆفسکیدا، ئیڤان باس لەو ناهەقییە دەکات و دەڵێت: "من خودام قبووڵە، بەڵام ئەو جیهانەم پێ قبووڵ ناکرێت دروستی کردووە، هەر بۆیەشە بلیتی هاتنە ناو ئەو جیهانەی بۆ دەگێڕمەوە، بێ ئەوەی بەکاری بهێنم".

بە ڕاست کێ لێ نەگەڕا ئەم بلیتە بەکار بهێنین؟! ئەوانی تر؟! ئێمە؟!

ئۆکتافیۆ پاز، چەندە جوانی فەرمووە: "ژیان کەی هی من بووە؟! ژیان هەمیشە هی ئەوانی ترە، کە ئێمەین". ئەو ئێمەیەی لێ ناگەڕێ هەر کەسە و خۆمان بین، ئەو ئێمەیەی زمان و دابونەریت و گرێبەستە کۆمەڵایەتییەکانی پێش من و تۆی داهێناوە. بۆیەشە تا ئێستا مرۆڤ ناتوانێت بێ فیلم و شیعر و چیرۆك و گۆرانی بژیت، چونکە ئەو ئێمەیە لێ نەگەڕان کەس ببێتە ئەو کەسەی کە دەیویست.

پێ دەچێت لە بنەڕەتدا بوونە خۆت مەحاڵ بێت، ئەو مەحاڵەی عەبدوڕەحمان ئەلداخیل لە تێکستی (هەڵۆی قوڕەیش)دا باسی دەکات: "پێی گوتم: لە کونی دەرزی دانیشە، شوێن نەگۆڕیت و ئەملا و ئەولا نەکەیت. گەر دەزووەکە هات بەرت نەکەوێ، گەر دەریشچوو لێ نەگەڕێی. بەو حاڵەوەش کامەران بە، چونکە من مرۆڤی کامەرانم خۆش دەوێ".

ئای.. خەریکە ئەم دەفتەرەش دەبێتە جۆرێك لە ئەشکەنجەدانی

تۆ؟ کەی ناچاریت ئەو هەموو حیکایەتە ناخۆشانەی من ببیستیت؟ لەوانەیە هی ئەوە بێت کە دڵنیایت تەنها دەتوانم لەناو کتێباندا بژیم؟ یان دڵنیایت کە من دوو ژیان ژیاوم؟ ژیانێك لەناو خەڵك و ژیانێکیش بەدزییەوە لەگەڵ ئەوینت؟ ڕاستییەکەی من لەناو خەڵکدا نەژیاوم، تەنها گوزەراوم. ژیان مانایەکی باڵاتری هەیە لە گوزەران. گوزەران واتا پەتاتە کڕین و هاوسەرگیری و خوێندن و دەوام، بەڵام ژیان نا.. ژیان وەك گوزەران نییە کات و شوێنی بپێورێت، ڕەنگە یەك دەقە لەباوەشکردنی ئازیزێك تامی نیو تەمەنی تەواو بدات، پاڵنانی عەرەبانەیەك لەگەڵ پیرەمێردێکی کرێکاردا بۆ مەودای پەڕینەوە لە تاسەیەك، یەکسان بێت لە چوون و هاتنەوە لە سەفەرێکی درێژ. خوێندنەوەی نامەیەکی پاش دابڕان ئەو هەستەت دەداتێ پەنجەکانت بوونەتە دە دڵ و بەیەکەوە لێ دەدەن. بەڵێ ژیان لە گوزەران قووڵترە، هەر بۆیەشە شاعیرێکی وەکوو ئالیۆت دەپرسێت: "کوا ئەو ژیانەی بە گوزەران لەدەستمان چوو؟!"

ڕاست دەکا: ئێمە ژیانمان بە گوزەران لەدەست چوو.

خۆ لەوانەشە هی ئەوە بێت کە حەزت لە فیلمە، حەزت لەو دیمەنانەیە کە دەشێت هەموو شتێك ڕوو بدا، کوولەکەیەك ببێتە عەرەبانە و دوو ئەسپی باڵدار ڕایکێشن و بتوانیت وەك سەندرێلا تا نیوەی شەو لای من بمێنیتەوە. سەگێك، پشیلەیەك لەباوەش بکەیت و بە ماچێك بگۆڕێ و ببێتە سوارچاکی خەونەکانت. ئامێرێکی زەمەن هەبێت و بمانباتەوە بۆ گەنجیمان، بۆ ئەو کاتانەی دنیا

هێندە زاڵم نەبوو، نە تۆ ناچار بوویت وەك ئێستا لە هەموو سەفەرێکتدا بە بیانووی کڕینی دیاری بۆ خزمەکانت، لە ئەنقەرە، لە شارۆچکەیەکی ئەوپەڕی سویسرا، دەفتەری بەرگ ئەفسووناوی بۆ من بکڕیت و لە ژێری ژێرەوەی جانتای جلوبەرگەکانتدا بیشاریتەوە و منیش حیکایەتە بێتامەکانی خۆمی تێدا بنووسمەوە، نە منیش ناچاربووم وەك ئێستام بە ناسینی کەسانی نوێ، بێتۆیی پینە بکەم. من تەنها لەگەڵ تۆ ژیاوم و سەیریش لەوەدایە دنیا لێ نەگەڕا تەنها لەگەڵ تۆدا بژیم..

هەموو شتێکم پەیوەندی بە تۆوە هەبووە، کە قسەیەکی خۆشم بیستووە خەفەتم خواردووە و بە پشتی دەست لە نێوچەوانم داوە، تۆ لەوێ نیت پێبکەنیت. کە دیمەنی هەژارێکم دیوە، خەفەتم لەو خواردووە تۆ لەوێ نیت تا بەیەکەوە دڵی بدەینەوە! بە هۆی تۆوە تێگەیشتم بۆچی ئەوانەی کەسێکیان خۆش دەوێ زوو زوو خۆیان دەشۆن و عەتر دەکەن و هەمیشە جلێکی یەدەگیان بە ئوتووکراوی لەناو کانتۆردا هەیە بۆ هەر یەکتر بینینێکی کتوپڕ، بۆچی عاشقەکان کە دەخەون ڕوو لە دیوار دەکەن، نایانەوێ هیچ شتێك لە ژوورەکە بۆ یەك لەحزە سەرنجیان ببات، سەدان جار دوایین یەکتربینین لەبەرخۆیەوە دەگێڕنەوە، خۆشەویستەکەی دەخاتە نێوان خۆی و دیوارەکەوە و تێر نابێت لە دووبارەکردنەوەی دیمەنەکان. هەموو ئەوانەی سواڵی چێژی ناسینی کەسانی زۆر دەکەن، لە بنەچەدا پەیوەندییەکی جوانیان دۆڕاندووە، لەو باڵندەیە دەچێت لە قوماری گمەگمێکدا هێلانەکەی دۆڕاندووە و هەر ڕۆژەی بە نیشتنەوەی کاتیی سەر درەختێك نائومێدیی خۆی دەشارێتەوە.

هەنری باربۆس ڕۆمانێکی هەیە بە ناوی (دۆزەخ)، پاڵەوانە بێناوەکەی نایەتە دەرەوە، پەیوەندی لەگەڵ کەسدا نییە، کونێك لە دیوار دەکات و تەنها لە ڕێی ئەو کونەوە تەماشای دنیا دەکات، منیش وام: لە ڕێی پەنجەرەی تۆوە تەماشای دنیام کردووە. دەزانم وشەکانی ناو ئەم دەفتەرە مایەی ئەزیەتدانی تۆن، ئەمە ئەوپەڕی خۆپەرستیم دەردەخات کە تۆم بەو هەموو ناسکییەوە، کردۆتە بزمارێك بە دیواری ئەم جیهانەدا و شکست و نەگونجان و پاساوە نەشیاوەکانی خۆمت پێدا هەڵدەواسم. تۆ نازانیت چەندە هەست بە ئازاری ویژدانم دەکەم کە وشەکانی ناو ئەم دەفتەرەت وەك بلیتی چوونە ناو جیهانێکت پێ دەفرۆشم بێجگە لە وەهم هیچی تر نییە. دەزانی چۆن وەهمێك؟ کاتی خۆی کە تازە هەراش دەبووم، باوکم لەپێناو سەلامەتیی عەقڵم پێی ناخۆش بوو کتێب بخوێنمەوە، زۆر جار بۆ ئەوەی نەزانێت، دارێکم دەهێنا و لە جێگەکەی خۆم دامدەنا و بەتانییەکەم پێدا دەدا، گلۆپی عەموودەکەی بەردەرگامان سەربانەکەی ڕووناك دەکردەوە، دەچوومە سەربان دەمخوێندەوە. زۆر جار پێم وایە ئەوەی ئێستا خۆمم و ناوم دەزانن و بیتاقەی بایەعیم بە ناوەوەیە، ئەوە دارەکەی ناو نوێنەکەیە.. دەنا منی ڕاستەقینە ڕۆیشتووم. کاتێ گەنج بووم، پێم وابوو ڕۆیشتووم بۆ ئەوروپا و مۆزەخانە و قومارخانەیەك نەماوە شەوانم تێدا بەسەر نەبردبێت، دواتر کەمێك گەورەتر بووم و وام دەزانی لەگەڵ هەموو تەقەیەك لە بەعس، منی ڕاستەقینە لەوێم، باش بوو زوو لەم درۆ شۆڕشگێڕانەیە دەربازم بوو، هەتا تۆم ناسی و خۆشم ویستی، ئیتر تەواو، زانیم منی ڕاستەقینە تەنها لای تۆ بووم، ساڵ بە ساڵ لەگەڵ تۆدا گەورە بووم، لە بچووکیتدا

منیش لەو ڕەسمەدا دەرچووم کە تیایدا لە ئاقاری گوندەکەتان دایك و باوکت دەستیان گرتوویت بە کراسێکی سپیی گوڵگوڵییەوە پەنجەیەکت لە دەمدایە. هەرچەند جارێ لە ڕێگەی مەکتەبدا توانجێکی نەشیاویان تێ گرتوویت، من لەجیاتیی تۆ بە گریانەوە لەسەر دەم کەوتووم. کە لە پۆلدا گوتووتە: مامۆستا بڕۆم ئاو بخۆمەوە؟ من گوتوومە: بڕۆ بابی من. بوومەتە ئاوێنە و پارمەتیم داویت لە تاقیکردنەوەی یەکەم سووراو. پێستم بۆتە ئەو چادرە بۆرەی دوکانێك لە بازاڕدا تا باران خۆش دەکاتەوە، لەژێریدا خۆت و خوشکەکەت وەستاون. چاوم بۆتە ئەو چاوەی لە خەیاڵتدا بەرامبەری ڕاهێنانت لەسەر فێربوونی چاونوقاندنێکی بە عیشوەوە کردووە. ناوکم بۆتە ئەو چاڵەی لە پاریدا دەتویست بە نینۆکی پەنجە، مووروەکانت بخەیتە ناویەوە.

بە خەیاڵ لەگەڵمدا بوویت، هەموو بەرەبەیانیانی جەژن، وەکوو براژنەکانم تۆش دەستی باوکمت ماچ دەکرد. تۆش دانەیەك لەو کێکە زەردانەت وەرگرتووە ئەو کاتانەی داپیرەم نانی دەکرد و سەرم بە ڕانی دەکرد، تۆنێك خوارتر لە دەنگی پرێمزەکە بۆ مردووەکانی دەگریا و جار جارە لەگیرفانی کەوا ڕەشەکەیدا بە دزی هەژارییەوە پارچەیەکی دەدامێ.

بۆ خەونی نزیکیت، بۆ خەمی دووریت، پەنام بۆ زۆر شت بردووە، بوومەتە دوو کەس، بە دوو کەسایەتیی جیاواز. کەسێکی ئاسایی وەك ئەو منەی لە شێوەی دارێکدا لەناو نوێنەکە بەتانیم پێدا دەدا، کەسێك دەوام دەکا و سەموون دەکڕێت و دەچێتە پرسە و ئامۆژگاریی منداڵ دەکا و بۆ ڕازیکردنی غروریان پرسوڕا بە خزمەکانی

دەکات. دەیەوێت ببێتە بوونەوەرێك خەڵك و خوا لێی ڕازی بن. لە ڕووی دەروونییەوە ئەم جۆرە کەسایەتییە فیتشی پێ دەڵێن، لە قسە و ڕەفتاردا پۆشتە و ڕێك دێنە بەرچاو، بەو ئومێدەی ڕێگە نەدا کەس لە درزی شەرەف و ئایین و نیشتیمانپەروەرییەوە لێی بێتە ژوورەوە، بەو ئومێدەی کەس ئیبلیس و فریشتەکانی ناوەوەی نەبینێت. ئەم جۆرە "من"انە وێڕای ئەوەی لە مێژوودا هەمیشە دەسەڵاتیان هەبووە، هەمیشە شاردنەوەی ناوەوەیان بۆتە مایەی بەهێزدەرکەوتنیان، بەڵام مرۆڤی بێبەهرەن، بێگومان گەر بەهرەی درۆکردن نەژمێرین.

دنیابینیان وەکوو کرمەکانە: کرم کاتێ لەسەر گەڵایەك دەخشێت وا دەزانێت ئەو چەند سانتیمەترەی دەیبینێت هەموو گەردوونە و بەو دنیابینییەش نەك بەس لێکدانەوە بۆ گەردوون دەکات، بەڵکوو حوکمیشی لەسەر دەدات.

ئالیۆت لەگەڵ ئەمانەی بوو کە نووسی: "مردووەکان لە قەبرەکانیان بە چاوی ئەبلەق و دەمی کراوەوە، بەسەرسوڕمانەوە لە جووڵەی بێمانا و بێسوودیان دەڕوانن".

منێکی تر هەیە، پێچەوانەی ئەمە: دنیابینیی باڵندەی هەیە، گاڵتەی بە هەزارەها، ملیۆنەها لەو سانتیمەترانە دێت کە دنیابینیی کرمیانەیە، سۆرین کیرکیگارد لەکتێبی (تێکدەر)دا وەك باڵندەیەك لە بەرزایی گومانەوە دەنووسێت: "کەسێك لە ئێمە پەنجە دەخاتە ناو خۆڵەوە و لە ڕێی بۆنی خاکەوە ئەو زەمینە دەناسێت کە ڕۆڵەی ئەوە، من پەنجەم دەخەمە ناو بوون و بۆنی هیچی لێ نایە، من لە کوێم؟ من چیم؟ ئەگەر ئەکتەرم کوا دەرهێنەر؟ کێ دەرهێنەرە با بیبینم!"

لە نووسینەکانی سەنسکریتی و هیرۆگلیفییەوە تا ئێستا، لە ئەنکیدۆ و هۆمیرۆس و دانتی و گۆتە و موتەنەبییەوە تا ئێستا، ڕۆحە مەزنەکان بە (کرمبوون) ڕازی نابن.

ئەمانە باپیرە گەورەی هەموو ئەو مرۆڤانەن کە ئامادە نین پارچە دارێك بن لەناو نوێندا، کە باپیرە گەورەی منیش بن کەواتە هەقمە لە ڕێگەی ئەوانەوە بەو منە شاراوەیە تۆم خۆش بوێت کە شەوێك لە سەریانەوە بەدەم خوێندنەوەی کتێبەوە ڕۆیشتووم و لای تۆ گیرساومەتەوە.

منیش هەقمە وەك سەنسکریتی، شێوەی کلیلێك بکەمە پیت و دەرگای لوغزت بکەمەوە.

هەقمە وەك هیرۆگلیفی، خەیاڵ ئازاد بکەم و شێوەی بەردێکت بدەمێ و بڵێم مانگی منیت.

منیش هەقمە وەك گلگامێش، دەماری سەوزی لاجانگت بە گیای نەمری بزانم.

هەقمە وەکوو گۆتە، شیرازیاتی خۆمت بۆ بنووسمەوە.

منیش هەقمە وەکوو دانتی، کۆمیدیای خواوەندێکت بۆ چێ بکەم تیایدا دۆزەخ ئەو ڕۆژانە بێت بەیەکەوە نەبووین، پاقژگە ئەو وەرزانە بێت خۆشم ویستی و فیردەوسیش ئەو ساڵانە بێت خۆشت ویستم.

هەقمە وەك موتەنەبی، بڵێم: "ئەگەر لە زەمان و ڕەفتارەکانی ورد ببمەوە، دەبینم کە مردن دوور لە تۆ، جۆرێکە لە کوشتن."

وەك باڵندە وشەکانم کۆکردۆتەوە، باڵندە کە هێلانە چێ دەکا، خۆی پووش و چیلکە دروست ناکا، لە هەر درەختێکەوە پارچەیەك دەهێنێت. نووسینیش وەك هێلانە چێکردنە، هەر هەست و

دەربڕین و وشەیەك لە ئەزموونێکی بیستن و بینین و خوێندنەوەدا دێن، هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات خۆی خاوەنی کارگەی دروستکردنی هەستەکانییەتی ئەوا نەك درۆ دەکات، بەڵکوو فێڵبازیشە. کێ دەزانێت خاوەنی دۆزینەوەی یەکەم باوەش کێ بوو؟ نووسەری یەکەم نامە لە مێژوودا کێ دەیناسێت؟ ئەوەی بۆ یەکەم جار گۆرانیی دۆزیەوە ناوی چ بوو؟ هەستە خۆش و ناخۆشەکان، گریان و پێکەنین کێ داهێنەریان بوون؟

ئەو هەستانە دروستکراوی من نین، بەڵام دڵنیام: هەموویان بۆ تۆن.

لە گەنجیدا مرۆڤ لە گوڵەگەنم دەچێت، پڕە لە دەنکە خەون و وزە و زەردەخەنە، هەموو بەیانییەك بە شنەی بەدیهێنانی ئاواتێك دەلەرێتەوە..

بەڵام، یەکێك لە سوودە دەگمەنەکانی گەورەبوون ئەوەیە، چیتر گوڵەگەنم نەماویت، تەمەن یەکە یەکە دەنکەکانت دەبا و دەیهاڕێت. ئیتر وەك پووشوپەڕاش کەس تەماعی دروێنەت ناکا و تەنها بە کەڵکی ئەوە دێیت ببیتە گسك و یادەوەریی ڕۆژە ڕژاوەکانت کۆکەیتەوە.

ئەم دەفتەرەش: ڕۆژە ڕژاوەکانی منە.

# خۆشەویستیی دۆڕاو و ڕقی براوە

لە سەردەمی هەڵکەندنی ویژدان و چاندنی قژدا، لە ڕۆژگاری جوانکردنی لووت و بۆنە ناخۆشەکاندا، قەڵەوکردنی لێو و لاوازیی قسەدا، لە زەمەنی خوێندەواری و نەخوێندنەوەدا، دەژین..

ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە؟

دەی دەزانی بۆچی هەمیشە ڕق براوە بووە؟ چونکە وەك ئیکۆ دەڵێت: ڕق ئاسانە، بە ئاوڕدانەوییەك، بە یەك تەماشا ڕقت لە کەسێك دەبێتەوە، بەڵام گەر بتەوێ هەمان ئەو کەسەت خۆش بوێ چەند ساڵێکت دەوێ. ڕاستییەکەی ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ پێچەوانەی مێژوو مەلە دەکەن، چونکە ئاراستە ڕاستەکەی مێژوو، ڕق بووە نەك خۆشەویستی. ڕق بەخشندەیە، ئێستا کە من تۆم خۆش دەوێ، نامەوێ کەسی تر تۆی خۆش بوێت، تۆش بێجگە لە من کەسێکی ترت خۆش نەوێت، کەوایە خۆشەویستی سنوور دادەنێت، بەڵام ڕق کراوەیە، من گەر ڕقم لە کەسێك بێت پێم خۆشە تۆش ڕقت لێی بێت، تۆش هەر وەهایت. چونکە ڕق

دەتوانێ ببێتە بیرۆکەیەك خەڵکەکانی لەپشت کۆبێتەوە، ڕق دەتوانێ ببێتە نەتەوەیەك و ڕقی لە نەتەوەیەکی تر ببێتەوە، ببێتە شارێك و ڕقی لە شارێك ببێتەوە، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا سیاسییەکان لەسەر ئەو ڕقە ژیاون، بۆ ئەوەی خۆشەویست بین دەبێت ڕقمان لەو دوژمنە ببێتەوە کە سیاسەت دەستنیشانی دەکا..

تۆ ببینە، لەتەنیشت ئەو خۆشەویستییەی لە داستانی ئەلیازە و ئۆدیسەی هۆمیرۆسدا بەدی دەکرێت، چەند شەڕ و ماڵوێرانی و جەنگی سیاسییەکان هەیە؟ چەند ڕق و دوژمن دروست کراون؟ یەك ئەلیادە و ئۆدیسە و سەدان شەڕ..

یەك هۆمیرۆس و سەدان کالیگۆلا..

یەك ئۆرفیۆس و سەدان نیرۆن..

یەك سوقرات و سەدان ئەسکەندەر..

یەك دانتی و سەدان یۆلیۆس قەیسەر..

یەك عوودی ئەندەلوسی و سەدان ئەتێلای هۆنی..

یەك کەناری ئارام و سەدان هەنیبەعل. یەك حوسێن و سەدان جەنگیزخان..

یەك حەلاج و سەدان حەجاج..

یەك گۆتە و سەدان هیتلەر..

یەک ئەنجیلۆ و سەدان مۆسۆلینی..

یەک مەولانا خالید و سەدان عەلی کیماوی..!

لە تەنیشت جوانییەکانی عەشتار و تەمووزدا چەند زۆرانبازی و شکست هەیە؟ یەک مشت فرمێسکی عەشتار و تەمووز و هەزاران هەزار گالۆن خوێن لە میزۆپۆتۆمیا.

لەتەنیشت چامەکانی سالم و کەرامەتەکانی نالی و بانگەوازە جوانەکانی حاجی قادری کۆیی و تەقەتەقی ڕۆشنگەریی چاپخانەکەی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد، چەند ڕق و چەند خیانەت و چەند ئابڕووچوون هەیە؟ یەک سالم و سەدان جاسووسی تاران، یەک نالی و سەدان سیاسیی بێکەرامەت، یەک حاجی و سەدان مەلای خەتێ، یەک پیرەمێرد و سەدان قەڵەمفرۆش، یەک مەم و سەدان بەکرۆکە، یەک لاس و سەدان تیربەدەستی چڵکن..

ڕق و ڕق و ڕق، تۆ دەسەڵاتێکت بینیوە بە هاووڵاتییەکانی بڵێ یەکترتان خۆش بوێ؟! تا من سەدان دەسەڵاتت نیشان بدەم دەڵێت چەک هەڵگرن بەرامبەر دوژمنەکانتان.

چوار هەزار و سێسەد ئایین لە جیهاندا هەن، کامەیان دەڵێن کافرەکانتان خۆش بوێ؟ تا من هەزارت نیشان بدەم دەڵێ بیانکوژن.

کێ ئەو هەموو ئایین و فەلەکناسی و فەلسەفە و گۆرانییەی خستە ناو ئامێری ڕقەوە؟

کێ موعجیزەکانی مووسای گۆڕی بۆ کوشتارگەی سەبرا و شاتێلا؟!

مەسیح نان نەبوو بیخوات، قەشەیەك خاچێکی لە ملدایە چوار کیلۆ ئاڵتوون دەبێت.

کێ مزگەوتی لە ماڵی حیکمەتی هاڕوونەوە کردە شوێنی دژە مەلای جزیری و دژە خانی؟!

ئەو هەموو کاغەزەمان لە گۆشتی درەخت بڕییەوە تا دارستانێك ڕقی پێ بنووسینەوە!

ئەو هەموو سەوزاییەمان لە ئاژەڵەکان کردە جادەی دووساید تاوەکوو بگەینە مەنزڵگای ڕق!

ئەو هەموو ڕەوانبێژییە چۆن گۆڕا بە جنێو؟!

ئەو هەموو دەنکە پڕە، چۆن لە مەنجەڵی پڕ فرمێسکی مێژووماندا ژێر ئاو کەوتن؟!

ئەو هەموو دەنکە پووچە، چۆن لە مەنجەڵی پڕ فرمێسکی مێژووماندا سەر ئاو کەوتن؟!

کێ باکی بە خۆشەویستی هەبووە؟!

ماڵی شیعر، ماڵی داستان، ماڵی حیکایەت و ئەفسانەکان، ماڵی هونەر ئاوا بێت وای لە مرۆڤایەتی گەیاندا کە خێر و شەڕ یەکسانن و لە کۆتاییدا خێر دەیباتەوە، لە ڕاستیشدا بیرم نییە لە شوێنێکدا خێر

براوە بووبێت، سەرەتا بە ناوی خێرەوە هاتوون، بەڵام لە کۆتاییدا زۆر لە شەڕەکانی پێشوویان خراپتر بوون، نموونەی شۆڕگێڕەکانت لەبەر چاوە؟ شۆڕشگێڕەکانی کووبا و ڕۆمانیا و ڕووسیا و کینیا و جەزائیر و میسر و فەنزوێلا و ئێران و تورکیا و عێراق و کورد، ئەو گۆی زەوییەی سەر مێزی بەڕێوبەرێکی قوتابخانە بێنە و بیسووڕێنەوە و بە دڵی خۆت بە پەنجەت ڕایبگرە، بزانە وڵاتێك دەدۆزیتەوە شۆڕشگێڕەکان کاولیان نەکردبێ؟! هەر لە ئەرستۆوە بگرە کە بە دەستی قوتابییەکەی خۆی ئەسکەندەری مەقدۆنی نەفی کرا و لە دوورەوڵاتی سەری نایەوە، تا دەگاتە شەهید سەردەشت عوسمان، لە ئاگرەکەی کۆپەرنیکۆسەوە بگرە تا دەگاتە ساردکردنەوەی بەکر عەلی: چییان بەسەر جوانی و پاکی و دڵسۆزی نەهێنا؟!

سەلمان ڕوشدی لە ڕۆمانی (منداڵانی نیوەی شەو)دا باشی پێکاوە کە دەڵێت: هەمیشە شۆڕشەکان سەری ئەولادەکانی خۆیان دەخۆن..

خۆشەویستی پاکبوونەوەیە لەو مێژووە، خۆشەویستی بە سەرسوڕمانەوە تەماشاکردنی سیسرکەیەکە کە توانیویەتی وێڕای ئەو هەموو لافاو و ئاگر و زەمینلەرزەیە بگاتە ئێستا، ملیۆنان جۆری دڕندە، بە دەیناسۆرەکانیشەوە لەناوچوون، کەچی ئەم توانی بێچووەکانی بگەیەنێتە ئەمڕۆمان. ئەمە چ جای چۆلەکەیەك بە دیار دوو زەڕنەقووتەی دەمکراوەوە دانیشتووە.

خۆشەویستی وەکوو زەڕەبین وایە، تیشکەکانی هەتاو لە یەک خاڵدا کۆ دەکاتەوە و ئەوەی لەژێریدا بێت دەسووتێ، ئێمە بۆچی لەبەر هەتاودا ناسووتێین، چونکە تیشکەکانی پەرتن، کاری زەڕەبین ئەوەیە هەموو تیشکەکان لە خاڵێکدا کۆ دەکاتەوە، خۆشەویستییش هەموو خۆشییەکانت لە کەسێکدا بۆ کۆ دەکاتەوە، ئەوەی دیکە کە ڕۆتینی ژیانە دەسووتێ، خۆشەویستی تێگەیشتنمان بۆ شەو و ڕۆژ، تێك دەدا، "شەوباش"ێك دنیا ڕووناك دەکاتەوە. "پێم ناکرێ بێم" نوێژی نیوەڕۆت لێ تاریك دەکا.

ڕۆتین، ناهێڵێت: دنیا دەکاتە پرتەقاڵێك کە سەنتەری نییە و هەموو شوێنێکیشی سەنتەرە.

زۆربەی هەرە زۆری خەڵك لە دنیا تووڕەن و لە خۆیان ڕازین، من لە دنیا ڕازیم و لە خۆم تووڕەم، چونکە دانیشتووم دەنووسم..

دەنووسم!

لە کاتێکدا دەبووایە بێم و لەگەڵتابم.

# خۆشەویستی و مێژووی فێڵ

میشێل فۆکۆ لەبارەی مێژووی شێتییەوە پێی وایە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە دەگمەن عەقڵ لەگەڵ مێژوودا هاوکار بووە، ئاتامادەیی عەقڵیش واتا شێتی، لەوانەیە تەنها لە سەردەمی گریکەکاندا هاوکاری نێوان عەقڵ و مێژوو، عەقڵ و کۆمەڵگا، عەقڵ و ئینسان ببینین.

دەرکردنی ئەرستۆ لە لایەن ئەسکەندەری مەقدۆنییەوە، سووتاندنی غرناتە لە لایەن ڕۆمانییەکانەوە، سووتاندنی ڕۆما لە لایەن نیرۆنەوە، سووتاندنی کتێبخانەکان لە لایەن خەلافەتی ئیسلامی و مەسیحییەکانەوە، سووتاندنی قورئانەکان لە لایەن جەنگیزخانەوە، سووتاندنی کۆپەرنیکۆس چونکە گوتی زەوی بە دەوری هەتاودا دەسووڕێتەوە، سووتاندنی یەهودییەکان لە لایەن هیتلەرەوە، قڕکردنی فەلەستینییەکان لە لایەن یەهوودییەکانەوە، سووتاندنی مانگاکان وەك ئیهانەیەك بۆ هیندییەکان لە لایەن ئینگلیزەکانەوە، سووتاندنی ئەفریقیا لە

لایەن فەرەنسەکانەوە، وێرانکردنی نیوەی دنیا لە لایەن ستالینەوە، سووتاندنی پێنج هەزار ئینسان بە گازی خەردەل و سیانید و ڕووخاندنی پێنج هەزار گوند و ئەنفالکردنی سەد و هەشتا و دوو هەزار ئینسان لە لایەن بەعسییەکانەوە.

ملیۆنان ملیۆن گوتاری پڕ لە درۆ، ملیۆنان ملیۆن گۆڤار و ڕۆژنامەی پڕ لە فێڵ، ملیۆنان ملیۆن هەواڵی فەیك، ملیۆنان ملیۆن ئیشپێکردنی مندالانی خوار دە ساڵ، ملیۆنان ملیۆن لاقەکردنی ژنان و چی تر و چی تر و چی دیکە..

خیانەت؟ پیسکردنی ژینگە؟ ڕۆشنبیری قەڵەمفرۆش؟ دکتۆری بێویژدان؟ یاساناسی ساختەچی؟ شاعیری دەربار؟ سووکایەتی و ئەشکەنجەدان؟ ئایینناسیی بێ خوا؟

ئەمانە ڕووبارە گەورەکەی مێژووی مرۆڤایەتییە، لەو ڕووبارە جار بە جار جۆگەلەیەك بۆ جوانی و پاکی پەیدا بوون، پەنجەکانی سوقرات کە جامی ژەهرەکەی لەپێناو هەقیقەتدا خواردەوە، دەرزی و داوەکەی گاندی کە جلی خۆی دەدوورییەوە، عەرەبانەکەی ستیڤن هۆکینگ کە لە سەریدا سەری ڕووە و ئەستێرەکانی بەشی باشووری ئاسمان لار کردۆتەوە، تاقمی ددانی داپیرەیەك کە دوای مردنی هێشتا پێدەکەنێت، عەینەکی باپیرەیەك کە بە پلاستەرێك بەستراوەتەوە و کاتی خۆی مەولوودنامەی پێ دەخوێندەوە،

نامەیەکی دڵداری کە کچێك نەیوێراوە بینێرێت.. تۆش بە دڵی خۆت شتە بچووکەکانی تر بێننەوە خەیاڵت..

لەو مێژووەدا، هەتا درەختێك کراوەتەوە بێشکە، هەزاران هەزار بوونەتە تابووت.

لەو مێژووەدا، هەتا منداڵێك جووجکەیەکی بەخێو کردووە، ملیۆنان ملیۆن مریشك سەربڕاون.

هەتا دوو عاشق بە یەك گەیشتوون، ملیۆنان ملیۆن کەس هاوسەرگیرییان بە ناچاری کردووە.

باشە پرسیارێك؟ کەی عەقڵ هاوکاری مێژووی ئێمە بووە؟

ئەوەی گوزەراوە شێتی نەبووە؟!

شەڕی ناوخۆ شێتی نەبوو؟ تاڵانکردن و ئاوارەکردن و نۆکەربوون بۆ ئێران و تووران شێتی نییە؟!

ڕاکردن لە دەسەڵاتی کوردی و خنکان لە ئیجە، هاریکاریکردنی عەقڵە یان شێتی؟!

کەمن ئەو ژنانەی بە هۆی نامەیەکی خۆشەویستییەوە کوژران؟!

کەمن ئەو پیاوانەی تەمەنیان بە نیشتمان بەخشی و بە هۆی

خیانەت و پارەپەرستیی سەرکردەکانەوە گریان؟!

بەڵێ، شێتی، هاریکاری مێژووی ئێمە بووە.

# غەدرە سەرمەدییەکان

ئای.. خۆشەویستی چ غەدرێك دەکا!

شەهیدەکان لێم ببوورن، حیکایەتی ئەوم گێڕایەوە.

باخچەکان لێم ببوورن، پەخشانم بۆ گوڵە نایلۆنەکانی سەر سەلاجەکەی هۆنیوەتەوە.

مردووەکانم لێم ببوورن، بۆ لەدەستدانی ئەو زۆرتر گریام.

منداڵە کلێنس فرۆشەکانی سەرجادە لێم ببوورن، هەرچی بەرائەت هەبوو خستمە کۆشی ئەوەوە.

بیرم لەو کەروێشکە بەستەزمانە نەکردۆتەوە و جانتای چەرمم کردۆتە دیاری.

بیرم لەو هەموو ئاوە موقەتەرانە نەکردۆتەوە دەچنە جەستەی نەخۆشەکانەوە و بەردەرگا شووشتنێکی ئەو دڵخۆشی کردووم.

لەپێناویدا، جیاوازییم کرد لەنێوان کۆترێك و ڕشۆڵەیەك.

بێویژدانیم کرد لە وەسفی پەنجەرەی ژوورەکەی ئەو و دەڕابی دوکانی هێتیمێك.

نادادیم کرد لەنێوان قومری و مانگایەك.

لایەنگیری سویچی ئۆتۆمبێلەکەی ئەو بووم، بەرامبەر کلیلی

ماڵی خێزانێکی کرێچی!

ئێستا چ بڵێمە ئەو ژنانەی خۆیان سووتاند؟!

بڵێم: زیاتر خەفەتم لە سووتانێکی بچووکی پەنجەی تۆ خواردووە بە دەسکی مەنجەڵێك؟!

ئای.. خۆشەویستی چ غەدرێك دەکا!

# تۆ ئاوا لە دایک بوویت

ڕەشەبایەك هەڵیکرد..

لەگەڵ خۆیدا هەرچی دار هەبوو هێنای.

تەختەی تەنکی ژێربالی ئەو پیرەمێردانەی عەسران بۆ دامەکردن کۆ دەبوونەوە.

توێکڵی گوڵەبەڕۆژەی ناو لەپی جەمیلە بە دیار دیمەنی بووکگواستنەوەی ناو درامایەك.

تەختە قیمەی بەردەم ژنێك کە بە بیانووی پیاز وردکردنەوە، فرمێسکی غەریبیکردنی مێردە مردووکەی لە منداڵەکانی دەشاردەوە.

چەند چیلکەیەك لە هێلانەی ئەو پەڕەسێلکانەی بە عاقڵی بە دیار دوو هێلکەی خاڵدارەوە دانیشتوون.

ئاردەداری دروستکردنی لانکی منداڵێك کە بووکەشووشەکەی تێدا دەخەوێنێت.

چوارچێوەی وێنەیەکی هەڵواسراوی ڕەشوسپیی باپیرەیەك کە هێشتا دوای مردنیشی لە ڕوکنی ژوورێکدا بە ڕووی میوانەکاندا پێدەکەنێت.

ئەو ڕەشەبایە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ بەردەوام بوو..

بۆ دروستکردنی پشتی چەماوەی عوودێك بەردەوام بوو.

ئای پشتی دەربەڕیوی ئامێری عوود، هەر ڕێك دەڵێی سکی دایکتە،

کاتێك بە تۆوە دوو گیان بوو!

# ئەو منداڵەی دوو کەس دەیناسن

کە دوو کەس یەکتریان خۆش ویست، لەو ساتەوە وەك ئەوەیە منداڵێکیان ببێت و بەیەکەوە گەورەی بکەن، منداڵێك تەنها ئەو دوو کەسە دەیبینن..

لەوانەیە بوونی ئەو منداڵە بێت کە وا دەکات خوشك و دایك و هاوڕێ و دەوروبەری ژنەکە لە بریسکانەوەی چاوی بپرسن، بۆ هەمیشە چاوت پێدەکەنێ؟! بۆ بەردەوام خۆی جوان دەکات و زوو زوو خۆی دەشوات و یەکدوو جلی لەبەرنەکراوی لەناو کەنتۆرەکەدا بۆ هەر ڕۆوانێکی کتوپڕ ئامادەیە؟!

لە پیاودا شتەکان کەمێك جیاوازن، بێدەنگ دەبێت، حەز دەکات تەنیا بێت و لەبەرخۆیەوە بە ورتەورت گۆرانی بڵێتەوە، ئیرەیی بەو خزمانە دەبات لەنزیك خۆشەویستەکەی دەژین، هاوڕێیەتیی ئەو کەسانە دەکات لە ڕێگەیانەوە هەواڵی ئەوی دەست دەکەوێ..

ئەو منداڵەی نێوان خۆشەویستەکان، تەمەنی بەقەد ئەو تەمەنەیە کە یەکتر جێ دەهێڵن، هەیانە.

تەمەنی منداڵەکەیان دوو ساڵە، سێ ساڵە.. بەڵام زۆربەی پەیوەندییەکان لە لای ئێمەدا چوار ساڵن، ناشزانین بۆ؟ تەنانەت ئەمە لای شاعیرەکانیش هەیە، عەبدوڵڵا پەشێو باسی چوار ساڵ دەکات، نزار قەببانییش باسی چوار ساڵ دەکات و ئەلیجێری دانتیش لە کۆمیدیای ئیلاهی و ئۆڤید لە هونەری خۆشەویستی و زۆری تریش..

سەیریش لەوەدایە لە خۆشەوستیدا ئەو منداڵە شیر و سریلانك و مەمە و جلوبەرگی جیاوازە.. لەجیاتیی شیر، گۆرانییەك لەناو یادەوەرییەکدا دەخووسێنن و دەیدەنێ، بە توێکڵە پرتەقاڵ دەیشۆن، لەبری جلوبەرگ، بە ملپێچێکی دیاری، یان چەپکەگوڵێکی تەواوکردنی خوێندن، یان پیرۆزباییەکی ڕۆژی لەدایکبوون داپۆشراوە، بەو منداڵییەوە هەموو ئەو مورووو و گوارە و بازن و ملوانکانەی لە ملدایە کە وەك دیاریی دایك و باوکی گۆڕیویانەتەوە، ئەو مەچەکە بچووکەی سەعاتێکی گەورەی پیاوانەی پێوە کراوە.. یەکەم وشە کە فێر دەبێت نان و ئاو نییە، بەڵکوو وشەیەکە لە کوردیدا گوتنی بۆ منداڵێك زۆر زەحمەتە، ئەویش: بیرتەکەم.

هەندێکمان کۆدی مۆبایل و پاسوۆردی ئیمەیلمان ساڵ و ڕۆژی لەدایکبوونی ئەو منداڵەیە، زۆربەی کاتیش یەکدوو پیت لە ناوی ذایکی..

بێگومان مردن لە هەموو تەمەنێكدا خەمی زۆرە، بەڵام لە تەمەنی چوار ساڵیدا ڕەنگە زیاتر بێت، لەوانەیە لەبەر ئەوەی ئەو منداڵە نە هێندە ساوایە نەیگوتبێت دایە، باوکە..

نە هێندەش گەورە بێت بەشی خۆی لە ژیاندا بردبێت..

مرۆڤ تا بەتەمەنتر بێت زیاتر خەم لە نەمانی ئەو منداڵە دەخوات، بۆیە دەبینین ئەوانەی زۆر پیر دەبن منداڵەکانیان بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیان بانگ ناکەن، بەڵکوو بە ناوی کەسانێك ئێمە نەمانبیستوون، نەماننانسیون، دەشڵێن مرۆڤ کە پیر بوو لە هەموو نەهامەتییەکانی دنیا خۆش دەبێت، لە هەموو غەدرەکان دەبوورێت، تەنها لەوە نەبێت منداڵەکانی لە کەسێك نەبن کە خۆشی دەویست..

ڕەنگە ئەمە پاساوی ئەو ئەستەمییە بێت مرۆڤ تاهەتایە خەفەت لە نەمانی ئەو پەیوەندییە بخوات و متمانەی بە کەسی تر و خۆشەویستی تر نەمێنێ، ڕاستە دەڕۆن و دەژین و هاوسەرگیری دەکەن و منداڵی ڕاستەقینەشیان دەبێت، بەڵام لەسەر سفرە منداڵێك دیار نییە کە تەنها خۆی ناسیویەتی، منداڵێك بزرە و لەناو گۆرانییەکدا خەوتووە.. ئێمە وا ڕاهاتووین بەو کەسانە بڵێین کە خۆشەویستی خۆیان لەدەست داوە، شایستەی تۆ نەبووە و ژیان بەردەوامە و ئەوەی تۆی نەویست ئەوا هەزار جار نەتەوێ، بەڵام

ئەم قسانە تەنها دیباجەیەکی سوواون و ئەوان تەنها پەیوەندییەکیان لەدەست نەداوە: بەڵکوو منداڵێکیان مردووە..

کەسیش نییە نەزانێت: چەند زەحمەتە جەرگت بسووتێ.

# پارمەتی هەیە ئەم کورسییە ببەم؟

زۆر جار ویستوومە ببمەوە بەو کەسەی پێش ناسینت، بەدەم گوتنەوەی گۆرانییەك کە گرنگی بە ماناکەی نادەم خۆم دەگۆڕم و دەڕۆم و خۆم فڕێ دەدەمە ناو ئاژاوەی چایخانەیەك، یەکێك دەبینم هێندە بە وردی تەماشای پوولەکانی دۆمینەی سەر مێزەکە دەکات ئیرەیی پێ دەبەم، یەکێك دەبینم هێندە بە حەسرەتەوە سەر بادەدا بە هێنانی یەك و دووی زارێکی تاوڵە ئیرەیی پێ دەبەم، کورسییەك هەڵدەگرم و دوور دەکەومەوە و بیر لە تۆ دەکەمەوە، تەمەنێك منیش ئاوا بووم، تەمەنی پێش ناسینت.. خۆم بە تەواو دەزانی و نیوەم لە شوێنێکی تر نەبوو، ئەوسا چایەك تاڵ بووایە دەمگوت تاڵە و وەکوو ئێستا نەبووم بیخۆمەوە و بە قسەیەکی ناخۆشی تۆی بچوێنم، ئەوسا شەربەتێکی فرێشی گێزەر و پرتەقاڵ و زەنجەبیلم دەخواردووە، چونکە بیستبووم بۆ تەندروستی باشە، نەك وەك ئێستا بە پەنجە و ڕوومەت و خاڵەکانی گەردنت بیچوێنم و نیو سەعات بە دیارییەوە بێدەنگ بم، بە قومی بچووك بچووك دڵم نەیەت تەواو ببێت.

هاتمە چایخانە تا ببمەوە بەو مرۆڤەی شەش هەستەکانی هەر یەکە و لە شوێنی خۆیانن.. یەکێك لە چێژە بەئازارەکانی

خۆشەویستی ئەوەیە هەستەکان لە شوێنی خۆیاندا نامێنن، بۆن دەچێتە شوێنی تام یان بە پێچەوانەوە، دەستلێدان دەچێتە شوێنی بیستن یان بە پێچەوانەوە..

کورسییەك هەڵدەگرم و کەمێك دوور دەکەومەوە و بیر لە تۆ دەکەمەوە، دەنگی بەرز و تەقەی پوول و هاواری شاگردەکان دەبنە شتی تر، لە خەیاڵی مندا دەبنە شتی تر: دەبنە هاوار و تەقەتەقی کەرەستە و ئامێری ئەو کرێکارانەی ئەو خانووەمان بۆ دروست دەکەن کە تیایدا بەیەکەوە دەژین، چایەکەی بەردەمم دەبێتە ئەو چایەی خۆزگەم بوو عەسرێك لەگەڵ کەسوکارەکەت بمخواردبایەوە.

هاواری ئەو سەوزەفرۆشەی بەرامبەرم، دەبێتە بانگەوازی پیکابی گەڕۆکی میوەفرۆشی لای ماڵمان و تۆش خێرا چاکەتێك دەپۆشی و بە ڕاکردن دەچیتە بەر دەرگا، هێندە جوانیت کەس تێناگا کامەتان میوە لە کامەتان دەکڕن؟

لەگەڵ دەنگی پیاوێك بەئاگا دێمەوە دەپرسێت: یارمەتی هەیە ئەم کورسییە ببەم؟

بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم، دەبینم دوو کورسیم بردووە:

یەکێك بۆ خۆم..

یەکێکیش تا بیرم نەچێت چەندە بێ تۆم!

# جەستەیەکی یەدەگ بۆ هەمووان

جاران مرۆڤێکی کامڵ بووم.

ئێستا هەر پارچەیەکم بە کەڵکی شتێك دێت..

چاوم بە کەڵکی ئەوە دێت، نابینایەك ببیبات و بێ ترس لە جادەیەك بپەڕێتەوە.

پرچم بە کەڵکی ئەوە دێت، دایکێك ببیبات و لە پرسەی کوڕەکەی بیڕنێتەوە.

زمانم بە کەڵکی ئەوە دێت، گەنجێکی لاڵ ببیبات و ئێوارەیەك لە حەوشەدا بڵێت: هۆدا هاتمەوە.

ددانم بە کەڵکی ئەوە دێت، کچۆڵەیەکی ئێزیدی ببیبات و

گاز لە قۆڵی ئەو تیرۆریستە بگرێت بەزۆر لە ڕەسمێکدا

بەپێکەنینەوە بە خۆی نووساندووە.

دەستم بە کەڵکی ئەوە دێت، خنکاوێك ببیبات و بنجە گیایەکی پێ بگرێت.

سەرم بەکەڵکی ئەوە دێت، منداڵێك بە دزی باوەژنەکەیەوە بیبات و

لە حەوشەدا بیکاتە تۆپ.

پێستم بە کەڵکی ئەوە دێت، ئاوارەیەك بیبات و بیکاتە خێمە بۆ منداڵەکانی.

قاچم بە کەڵکی ئەوە دێت، عاشقێکی بێپارە بیبات و

تا گەڕەکە دوورەکەی یارەکەی بڕوات.

بەڵام هەموویان دەبێت سوپاسی تۆ بکەن ئازیزم..

بە تەنها تۆ

کە بە خۆشەویستیت هەڵتوەشاندمەوە.

# توحفە لەسەر توحفە

لەم گەردوونە بێکۆتایە، گەر ملیار و ملیاران ساڵی تیشکی بڕۆین هێشتا فراوانتر و فراوانترە.. تاکە شوێن کە تیایدا هەناسە هەبێت ئەم هەسارەیەی ئێمەیە، تاکە شوێن منداڵ بە کراسی شینەوە بڕۆنە مەکتەب، ئێرەیە. ڕەنگ هەیە و باران هەیە.. درەخت هەیە و ئۆکسجین دەدا..

بەپێی زانستی فیزیا، تۆز و غوبار لەم گەردوونە زۆر دەگمەنن، گەر بە قەد کەللایەك تۆزەکان بە هۆی هێزی کێشکردنەوە لە یەکتر نزیکتر ببنەوە بە لانیکەم پێویستی بە بیست و پێنج ملیۆن ساڵی تیشکی هەیە، ئەمە وا دەکات کاتێك بلۆکێك یان خشتێك دەبینیت لە باوەشی بکەیت، تەنها لەسەر ئەم هەسارەیەی خۆمان فرمێسك هەیە، چونکە گەر هێزی کێشکردن نەمێنێ فرمێسك ناڕژێ.. تەنانەت گریانیش کە ئەو هەموو قسەیەمان لەبارەی حاڵەتە درامییەکەیەوە هەیە، خۆی لە خۆیدا موعجیزەیە..

لەسەر ئەم هەسارە ناوازە و دەگمەنەدا کەسانێك هەن لە ڕۆژئاوا ڕقیان لە پرچی ڕەشی ئێمەیە، کەسانێك هەن لە ڕۆژهەڵات ڕقیان لە چاوی شینی ئەوانە.

کەسانێك هەن لەسەر ناو، تەنها ناو، خەڵك دەکوژن، کەسانێکمان هەیە ڕقی لە عەگالە، ئەوانیش کەسانێکیان هەیە ڕقیان لە جەمەدانییە.

ڕووسەکان دژی ئۆکڕان و کروات دژی بۆسنی و جوولەکە دژی موسڵمان و تورك دژی کورد و کورد دژی عەرەب و ئەمریکی دژی هیندییە سوورەکان و ئەڵمان دژی پۆڵەندی و تاڵیبان دژی هەمووانە، شارەکان دژی شارەکان و نەتەوەکان دژی نەتەوەکان و سنوور و پاسەپۆرت و مۆسیقای من و کولتووری من و نەوت و حەشیش و دەوڵەتی من و موخابەرات و سیخوڕی و تیرۆرکردن و بازرگانیی مرۆڤ و دەرمان و دزینی گورچیلە و کڕینی منداڵ و هتد..

گەر کەمێك بەرز ببینەوە، دوور نا، پیاسەیەك کە بە مووشەك لە ئێستادا بیست سەعاتێك دەخایەنێت و بڕۆینە سەر مانگ.. دووری مانگ لە ئێمەوە لەو ملیار و ملیارانساڵی تیشکییەی گەردوون، بەپێی ژمارەکان تەنها یەك چرکە و سێ بەشی چرکەیەك دوورە، لەو سەر مانگە تەماشایەکی ئەم هەسارەیە بکەین، دەبینین مانایەك نامێنێتەوە بۆ قژی ڕەش و چاوی شین بۆ عەگال

و قاتی مرادخانیت مانایەك نییە بۆ مندالی ئەلمان و پیرەمێردێکی جوولەکەی پۆلەندی، شنەبایەك نییە چ جای مۆسیقا؟ سەیرێکی ئەم هەسارەیە بکە و دەبینی کۆمەڵێك ئینسانی زیندوو بە دلی خۆیان وەرزی جیاواز و ڕەنگی جیاواز دەبینن، لەسەر مانگەوە دیارە ئەم هەسارەیە چ توحفەیەکی ناوازە و تایبەتە کە ئێمە دابەشمان کرد بەسەر هۆز و نەتەوە و دەفتەرێکی سپیارە کە ناوی نراوە پاسەپۆرت، نرخی ئەو هەموو جوانییەمان گۆڕییەوە بە پارچە کاغەزێك کە پێی دەگوترێت پارە..

باشە ئەگەر هەر یەکێکمان لە مۆزەخانەیەکدا توحفەیەك ببینێت تەمەنی پێنج هەزار ساڵێك بێت، بە سەرسوڕمانەوە سەیری ناکات؟! ڕێزی ناگرێت؟ ئەوە بەردەکەی حەمۆڕابی کە یاسای لەسەر نووسراوە، ئەوە تابووتەکەی تووت عنخ ئاموون، ئەوە دیواری ماڵەکەی مەئموون، ئەوە پەیکەرەکانی ئەنجیلۆ، کێ هەیە ڕێزیان نەگرێ؟! باشە بۆچی ڕێزی ئەم هەسارەیە ناگیرێت کە توحفەیەکە تەمەنی چوار ملیار و هەشت سەد ملیۆن ساڵە؟!

جا لەوەش جوانتر..

نا.. جوانترین ئەوەیە لەسەر ئەم هەسارە توحفەیە تۆشم ناسی و خۆشم ویستیت.

هەتا هێزی کێشکردن هەیە و مەودای فرمێسک ڕژان ماوە، بە چاوی پڕ ئاوەوە تەماشات دەکەم، ڕێك وەك توحفە لەسەر توحفە.

# پاکترین بەدلە

بەرەبەیانە و سەیارەی زبڵەکە هاتۆتە کۆڵانەکەمانەوە..

گەنجێك بە بەرگی شینی کرێکارییەوە ماڵ بە ماڵ خۆڵ و خاشاك کۆ دەکاتەوە.

دەچمە شوێنی ئەو گەنجە و ماڵ بە ماڵ دەگەڕێم..

لە هەموو ماڵێکدا وێنەی ئەو پیرەمێردانە بە دیوارەکاندا هەڵدەواسمەوە

کە دوای میراتی دابەشکردن لە کەنتۆرێکدا فڕێدراون..

دەرگای سەلاجەی ماڵەکان دەکەمەوە و

سەری قوتووی ماسییەکان ل ادەبەم و دەچرپێنم: دەریام دەریا.

نایلۆنێکی زۆر زۆر گەورەم لایە، لە ماڵەکاندا زبڵی ڕقەکان کۆ دەکەمەوە، زبڵی ناهەقییەکان.

ئەو هەڕەشانەی تێ دەکەم بە منداڵەکان دەگوترێن، ئەو توندوتیژیانەی تێ دەکەم بەرامبەر بە ژنەکان دەکرێن، ئەو جنێوانەی

تێ دەکەم بە هەولێر و سلێمانی دەدرێن، ئەو نامانەی تێ دەکەم کە ماڵئاوایی یەکجارەکی تێدایە، لە تەلەفزیۆنەکاندا ئەو کەناڵانەی تێ دەکەم فیرعەونەکانمان لێ دەکەنە مووسا، لە قاسەکاندا ئەو پارانەی تێ دەکەم بە حەرام پەیدا کراون، ئەو تفەنگانە دەبەم بۆ شەڕی براکان لەژێر نوێنن، سیسەمی ئەو ژن و مێردانەی تێ دەکەم بەناچاری لە تەنیشت یەکتر دەخەون..

دواتر لە شوێنێکی دوور دوور، هەندێ چیلکەی یادەوەری ورد دەکەم، بەچەخماخەی بەیەکدادانی ئەو دوو بەردەی دایکم لەسەر دۆڵمەی دادەنا ئاگرێك دەکەمەوە و ئەو عەلاگە پڕ مێژووە دەسووتێنم..

شەو دادێ و بەهیلاکی دەچمە بەردەرگای کەسێك خۆشم دەویست..

نایلۆنی ئەو غەدرانەی دنیا لە من و ئەوی کرد هێندە قورسە هەڵناگیرێت،

دەیکەمە سەرین و لێی دەخەوم.

## حەسرەت

ئەو ڕۆژانەی کە نابینم

دەیسەلمێنن شەو کات نییە..

شەو شوێنە و من خەڵکی ئەوێم!

# خۆشەویستی لە پەنجا ساڵیدا

کە دەگەیتە پەنجا ساڵیت، تەمەن بە ڕۆژ و هەفتە و ساڵ ناپێوێت، بەڵکوو بە دەیە، دەیەی بیستەکان و سییەکان و چلەکان و بەم شێوەیە..

لە دەیەی بیستەکاندا هەست دەکەیت گیرفانەکانت بەردەوام کونیان تێدایە و هیچ پارەیەکت بۆ کۆ ناکرێتەوە و زەندەقت لە دوارۆژ دەچێت.. لە دەیەی سییەکاندا هەست دەکەیت ئەم دنیایە خۆی وەکوو خوێدانێك کونکونە و هەرچۆنێك دەجووڵێیتەوە برینێکت دەکولێنێتەوە.

لە دەیەی چلەکاندا هەست دەکەیت دوو دەیەی ڕابردووت لێ بەربۆتەوە بە هۆی ترست لە قسەی خەڵکەوە.. بەڵام لە دەیەی

پەنجاکاندا دەزانیت ئەوەی کون بووە گیرفان و دنیا نەبوون، ئەوەی کون بووە یادەوەریی تۆیە و وردەوردە بەر دەبنەوە.. عەینەکەکەت لە چاوتدایە و بۆی دەگەڕێیت، لەوە دڵنیایت کەسێك لە شارێکی دیکەیە و لە بازاڕدا چاوی بۆ دەگێڕیت، دەخەویت و هەست دەکەیت یەکێك سەیرت دەکا، لە هەموو ناوەکاندا یەکدووانێك ماونەتەوە.. لەو هەموو ڕووداوە یەکدوو وێنە و چەند گرتەیەکی کورت لە خەیاڵت ماونەتەوە کە کات و شوێن و شێوەی لەشولاری ئێستات شایەتی ئەوەشت بۆ نادەن ڕاستی بووبن. لەو هەموو گۆڕانییانەی لەم جیهانەدا هەن یەکدووانێکیان چاوت پڕ ئاو دەکەن.. تێدەگەیت هەرچیت کردبێت لەپێناو کەسێك بووە.. ئەو کەسەی بە خەیاڵ چەند ساڵێك بەیەکەوە ژیاون، وەکوو ژن و مێردێك چیرۆکی ڕاستەقینەت لەگەڵدا هەبووە، بە خەیاڵ لەتەنیشتت لە میوانداری دانیشتووە و بە چاو پێت گوتەوە: ئەڕێ هەڵنەستین؟ شەڕت لەگەڵدا کردووە کە بۆچی سەری مەعجوونی ددانەکە هەموو جارێك کراوەیە؟ بۆ سابوون لەسەر مەغسەلەکە نییە؟ وردە گلەییی لێ کردووی: ئەوە بۆ برا گەورەکەکەت لە

سەفەردا گەڕایەوە و وەکوو براژنەکانت دیاری بۆ نەهێنابووم؟ ئەو گۆرانیانەی لەبەر خۆتەوە لە حەمام دەیانڵییت بۆ من نییە؟ بە خەیاڵ پیاسەی ئێواران دەکەن و وەکوو وەرزش بەبێدەنگی لە تەنیشت یەکتر لە پارکێکدا ڕێ دەکەن، تەنانەت کە بەو خەیاڵانە بە ڕێگادا دەڕۆیت و کەسێك لە دواوە بە ناوی خۆت بانگت دەکا، پێت سەیرە لە خەڵك دیاریت! پێت سەیرە تۆ بەڕاستی لێرەیت و لەوێ نیت! ئەو کەسە حیکایەتی تۆیە و نەشمابێت لە ژیانتدا لە ڕێگەی شتێکی دیکەوە ئامادەیە.. لە ڕێگەی تامی میوەیەك، بۆنی چێشتێك، ڕەنگی جلێك. زۆربەی ئەوانەی لە پیریدا ئامێرێکی مۆسیقی فێر دەبن بۆ تۆڵەکردنەوەیە لە دەیەکانی بیست و سی و چلەکانی تەمەنیان کە تیایدا نەوێراون هاوارەکەی دڵیان بە ئاشکرا بڵێن.. هەتا ناوەکان یەکسان بوون بە ڕووخسارەکان، هەلی گێڕانەویان هەبوو و لەدەستیان چوو.. ئەو عوودەی بە سەری ماشوبرنجییانەوە لە باوەشیان کردووە، ئەو کەمانچەیەی بە لاجانگیان دەنووسێ و لەگەڵیدا چاویان دەنووقێنن، ئەو دەفەی وەکوو منداڵێکی ساوا بەهێواشی کەمێکی هەڵدەدەن و

دەیگرنەوە.. لە خەیاڵیاندا مرۆڤێکە و تازە کەسیان نابنەوە بە منداڵی سەردەمانێك کە بۆ هەتاهەتایە تێپەڕی.

# جوانترین پێئەمەک لە دنیادا

باوکم باخەوان بوو، بۆ چاککردنی باخچەیماڵێك دەچووین..

لە پشتی پایسکلەوە توند پشتێنیم گرتبوو، تەمەنم هەر نۆ ساڵێك دەبوو. لەبەر هەتاوی پێش نیوەڕۆی ئابی هەولێر کە ناچارت دەکا هەموو ئەو کەسانەت بیر بکەوێتەوە ڕقت لێیان بووە، شیشەکانی کورسیی پشتەوەی پایسکلەکە داغیان کردبووم، تاکە شوێنی تەڕ، پشتێنەکەی باوکم بوو کە بە هەوای لێخوڕینەوە ئارەقەکەی فێنك دەکردەوە. کە گەیشتین بینیمان لەبەر دەرگای ماڵەکە دوو گەڵابە خۆڵی سوور هەڵدرابۆوە، ماڵێکی گەورە و پاك، گەراجێکی گەورەی هەبوو، لە گەراجەکە ئۆتۆمبێلێکی مارسیدیسی شینی ئاسمانی وەستابوو، حەوزێکی نایلۆنی گەورەی مەلەکردن پڕ ئاو کرابوو، تیایدا دوو منداڵ شەڕە ئاویان دەکرد کە دیاربوو بۆ ئەوان قوڕاوی گەڕەکەکەی ئێمە لە هەساریەکی دیکە بوو، تەنها چاڵی باخچەکە دیمەنی جوانی ماڵەکەی تێك دابوو، خاوەن ماڵەکە

ئیشەکانی لە باوکم گەیاند و گوتیشی هەر ئەمڕۆ دەبێت تەواو بێت..

- بە سەرچاو دکتۆر عادل...

باوکم بە منی گوت تۆ لەم سێبەرە دانیشە، خۆشی بە عەرەبانەیەکی دەستی خۆڵەسوورەکەی بەر دەرگای دەگواستەوە باخچەکە، دکتۆر عادلیش لەسەر مێزێك میوەی لەسەر بوو جار جارە میوەیەکی پاك دەکرد و دەیدایە دوو منداڵەکەی ناو حەوزەکە، هەوڵم دا یارمەتی باوکم بدەم عەرەبانەی پڕ خۆڵ لە هێزی منی ئەو سەردەمەدا نەبوو، ئێستاش کە دەبینم کەسێك دەنێژن چەند خەفەت لە مردووەکە دەخۆم ئەوەندەش خەمی ئەو خۆڵ بەسەرداکردنەم هەیە، چونکە دەزانم خاکەناسێك خۆڵ چەند قورسە، دوای نیوەکردنی دوو گەلابەکەی بەر دەرگا، باوکم هاتە تەنیشتم دانیشت، بە دەنگێکی نزم گوتی: گرانەتاکەیە، ئەمساڵیش یەخەی بەرنەدام..

باوکم لە سێبەرەکەدا خەوی لێ کەوت، دەسەسڕەکەیم برد و بە ئاوی بەلووعەی گەراجەکە تەڕم دەکرد، لە پەنا مارسیدیسەکە گوێم لە دکتۆر عادل بوو بە ژنەکەی دەگوت: ئەرێ خۆ ئەوە نووست، ئەو هەژارانە چەندە ڕێزیان بگریت زیاتر خۆیان لە ئیش دەدزنەوە، چەند ساختەچین خوایە..

ژنەکەشی گوتی: هەزار جارم پێ گوتی ڕێزیان مەگرە، بێئەمەکن..

لەوبەر، ئەوان بەدەم پاککردنەوەی پرتەقاڵێکەوە بە ڕووخسارێکی ترش سەیریان دەکردین..

منیش بە دەسەسرێکی تەڕ، ئارەقەی ڕوومەت و لاملی جوانترین بێئەمەکی ئەم دنیایەم دەسڕی..

# سابات

نازانم لە کوێدا خوێندوومەتەوە؟

بەڵام جوانترین شت لەبارەی باوکەوە نووسرابێت:

هەمیشە دایکمان پێی دەگوتین دەنگتان بەرز مەکەنەوە، چونکە باوکتان ماندووە و خەوتووە..

شەوێك هەمووومان، پڕ بە گەروومان قیژاندمان و هاوارمان کرد

کەچی بۆ هەتاهەتایە هەڵنەستایەوە!

# دەرۆزەی تەمەن

گاوەرە، گوندێك بوو نزیك شارۆچكەی مەخموور و تەنیا چیای قەرەچووغیان نێوان بوو، باپیرانم لە دایكمەوە بە بنەچە دەچنەوە سەر ئەو گوندە، کەمێك دوور لە جادەیە و کەوتۆتە بەرامبەر گوندی کەندار، من لەگەڵ ناوی کەندار هەمیشە مامۆستا عەبدوڵڵا پەشێوم بیر دێتەوە کە چەند ساڵێك لەو گوندە مامۆستای کوردی بووە و یەکێك لە شیعرە جوانەکانیشی هەر بە ناوی شەوانی کەندار نووسیوە:

وشەکانی شیعری ئەمشەو

ڕەوە کۆترێکی سپین

لە بەندیخانەی سینگما سەرسام ئەژین

دەنووك لە زامم وەر ئەدەن

ئاگر لە هەستم بەر ئەدەن

دەیانەوێ دەروازەکەی سینگم لەق کەن

دەرباز بن و تارای شینی ئاسمان شەق کەن

بەڵام دوودڵم نازانم، بۆ بەر پەنجەرەی کامە کچ

بەڕەڵاکەم کۆترەکانم

لە دوای ئەوەی خۆشەویستم

پەنجەرەی خۆی لێ داخستم.

منداڵ بووم باپیرەم چیرۆکێکی لەبارەی گاوەرەوە دەگێڕایەوە، ئێستا تێدەگەم چیرۆکە نەمرەکانی خۆشەویستی دەشێت لە شوێنێك بن کە بە زەحمەت دەچێتە عەقڵەوە، لە شوێنێکی وشکوبرینگی وەك ئەو گوندە حیکایەتی ئاوا بە خوناو و فرمێسك تەڕی تێدا هەبێت. گاوەرە دەوروپشتی خڕەبەردی سپی و گەورەی تێدابوو، ئەوەی مارکیز لە سەد ساڵ تەنیایی ناوی لێ ناون: هێلکەکانی مەخلوقاتی پێش مێژوو! تا چاو بڕکا خڕنووك و بنجی دڕکاوی سەببار بوو، ئەو سەببارەی شاعیرێکی عەرەب لە شەوێکدا بە هۆی تریفەی مانگەوە بە سواری حوشتر دەیبینێت و دەپرسێت:

ئەرێ کاتێك ڕەشەبا لە سەببار دەدا، کامەیان پێشتر دەڵێن: ئاخ؟ ڕەشەباکە بە دڕکەکانی سەببار بریندار دەبێت یان سەببار بە ڕەشەبا ئازاری پێ دەگا؟

لەو گاوەڕەیە پیرەمێردێك هەبووە ناوی عەوڵا بۆر بووە، لە گەنجیدا کچێکی ناسیاوی خۆی خۆش ویستووە و نەیانداوەتێ، کچە شوو بە پیاوێك دەکات لە گوندی کەنداری بەرامبەریان، ئەو عەوڵا بۆرە سوێند دەخوات کە نابێ پێش مێردی ئەو ژنە بمرێت، دوای شەست و یەك ساڵ لەو سوێندە هێندە پیر ببوو نەخۆش کەوتبوو، وەکوو جۆرێك لەو بێشعوورییەی زانستی وشك دەیخولقێنێت، دکتۆر پێی گوتبوو: هیچت نەماوە و پاش یەکدوو مانگی تر دەمریت.. ئیتر مەراقی ئەوەی دەمرێت و لە گوندەکەی بەرامبەریان دوژمنە سەرسەختەکەی ماوە نیمچە شێتی کردبوو، ئەو دەمرێت و هێشتا ئەو ژنە نانی بەیانی بۆ پیاوێکی تر حازر دەکا، ئەو دەمرێت و هێشتا ئەو ژنە پشتی پیاوێکی تر دەشوا، کراسی بۆ هەڵدەخا، کیسەی تووتنی تازەی بۆ بەرپشتێنی دەدوورێ، لە دەرگای حەوشە عەلاگەی میوە لە دەستی پیاوێك وەردەگرێت ئەو نییە.. بۆ ئەوەی کەمێك زیاتر بژی، دوای پەنجا ساڵ جگەرەی تەرك دا، باپیرەم دەیگوت ئەوەی ئەم چیرۆکەی نەزانیبا گاڵتەی پێ دەکرد کاتێك لەسەر سەکۆی چیمەنتۆی بەردەم مزگەوتەکە دادەنیشت و

گەنجێکی دیتبا بە هێواشی دەپاڕایەوە: کوڕەکەم تۆ گەنجیت، پانزە بیست ڕۆژێکم لە تەمەنی خۆت بدەیێ!

# ئەو پارچانەی ڕۆژانێک ڕووخسار بوون

دوای خۆشەویستیت چیتر ئەو پرسیارە سەرم ناخوا

بۆچی مرۆڤەکان یەکتر بریندار دەکەن؟

هەموو کەسێك لە ژوورەکەیدا ئاوێنەیەك هەیە ئازیزێکی تێدایە: قسەی بۆ دەکا و قسەی لەگەڵ دەکا

چیرۆکە شاراوەکانی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە

ئەو کەسەی ناو ئاوێنەکە ڕەنگە باوکی بێت، یان دایکی کە زووتر لە پێویست مردن

ڕەنگە عەشقێك..

هەموو ئاوێنەکان کەسێکیان تێدایە خۆشمان دەوێ

پێش هەموو کەس بەیانی باشمان لێ دەکا، دوای خۆگۆڕین، بەخەندەوە پێمان دەڵێ: جوانیت

دوای تاقیکردنەوەی جلێکی تازە، دەڵێ پیرۆزە

منیش جاران لەناو ئاوێنەی کەسێکدا بووم..

ساف و جوان بووم، زوو زوو بە هەڵمی ئاه دەیسڕیمەوە و

خۆی لەبەر مندا دەڕازاندەوە.

جێی هێشتم و وردی کردم

ئێستا لە خراپیم نییە، کە منیش جار جارە کەسێك بریندار دەکەم!

# شاری خەونەکان

ڕۆیشت و عەسرێك بەیەکەوە چایەکمان نەخواردەوە..

لە وێنەیەکی کۆنی هەولێردا بینیم:

ئەو گەڕەکەی ئێستا تیایدا دەژیت کێڵگەی گەنم بوو، تا چاوبڕکا گیا لە وێنەیەکی وەستاودا دەلەرییەوە، لەوانەیە شوێنی ئێستای خانووەکەتان، ئەوسا کەپری چاخواردنەوەی عەسرانی خێزانێکی جووتیار بووبێت.

کات تێپەڕی و جووتیار و کەپر و گەنم زەمەن هاڕی و لە یادەوەریشدا نەمانەوە..

خەمی ئەوەمە، دەزانم لە وێنەیەکی داهاتوودا، پاش سەد ساڵێك کەس نازانێت کەسێك لەم خانووەتان دەژیا بە ناوی تۆوە، کەسێکی جوان و خەمبار: خەمبار وەك ئەو تاقە گوڵەی مەغریبان لەناو سەبەتەی گەنجێك بە تەنیا ماوەتەوە کە لە ترافیکێکدا دەیفرۆشت..

پاش چەند جارێك لە سووڕانەوەی بێجەدوای ئەم هەسارەیە بە

دەوری خۆردا، قەلات ناوی ئێمەش دەخاتە ناو تۆمارە ونەکەی سەنحارییەوە و زیندوویتیی قۆلی سڕبووی بەهێواشی لەژێر سەرمان دەرهێناوە

کۆلان ماوە و من نەماوم بێم..

سەعات لە بازاڕدا ماوە و مەچەکت نا..

ملپێچ لە دوکانەکاندا هەیە و گەردنت نا..

خەڵك کولیچە و شەربەتی مێووژ دەکڕن و منیش لە گۆڕێکدا بۆ بیستنی ئایەتێك چاوەڕێی بەرەبەیانی جەژنانم

کە بیر دەکەمەوە شانە لە پرچت بەتەمەنترە

چەرخی هەڵواسراوی تەنیشت تەباخەکەت لە پەنجەت زۆرتر دەژی

لە پێشبڕکێی تەمەن گوارە لە گوێت دەباتەوە

جانتا لە پێستی تۆ و عەینەك لە چاوت و پێڵاو لە قاچت نەمرترن

کە دڵنیام ئەو پارچە تەنەکەی کە جەرەسی بەردەرگاتان لە باران دەپارێزێت دەمێنێتەوە و دەنگت ونبووە

لە خۆم و دنیا تووڕە دەبم

ئێ تا دەرفەت هەبوو ئازیزم

عەسرێك چایەکمان بەیەکەوە نەخواردەوە.

# گومانی شیرین

باشت کردووم، دوای ناسینت ئەو کەسانەم ئاشتکردنەوە کە وام دەزانی بایەخم نازانن.

ئاوڕم لە ڕابردووم دایەوە و داوای لێبووردنم لەو مامۆستایانە کرد لە مەکتەبدا گوێم بۆ نەگرتوون، لەو قوتابیانەی بۆ چوونە مەکتەب هاتوونەتە لام و بە برا بچووکەکەم گوتووە بڵێ لە ماڵەوە نییە..

لەو کچانەی بەڵێنی درۆم پێ داون

لەو هاوڕێیانەی لە چێشتخانەیەك بە ناوی دەستتشۆرینەوە پارەم نەداوە

لەو چۆلەکانەی بەردم تێ گرتوون، لەو سواڵکەرەی هیچم نەداوەتێ

لەگەڵ تۆدا، هەست بە گرنگیی خۆم دەکەم کە ناوم دەزانیت، کە هەواڵم دەپرسیت

پێش خەوتن، دوایین کەس تۆم لەبیرە

لە خەو هەستام، یەکەم کەس تۆم لەبیرە..

بەڵام جارجار گومانی گەورەم هەیە

بۆ نموونە:

ئەمڕۆ بەیانی باشی لێم نەکرد

چییە ڕۆژ لە لای ئەو هەڵنایە؟!

## فریادڕەس

پێم وابوو هەستی بۆنم نەماوە..

پاش ئەوەی لە منداڵیم، ڕۆژانە دەمبینی پلکم زارێ بێریەی سەربازیی کوڕە کوژراوەکەی دەردەهێنا و

بۆنی دەکرد و دەگریا، دەگریا و بە منیشی دەگوت کە گەورەبوویت بیگێڕەوە.

پاش ئەوەی لە گەنجیم، بۆنم کرد لە هەڵەبجە کیمیاوی بە منداڵان و دیوانەکەی عەبدوڵڵا گۆراندا کراوە.

پاش مردنی دایکم، بینیم کەس نییە بەرەبەیانی جەژنان کورسییەکەی باوکم بێنێتە ناوەندی حەوشە و

یەکە یەکە بۆنم بکا

پاش ئەوەی لە پیریم، بۆنم کرد کە بە هەمان ئەو ئاگرەی بۆ ژێر ئیبراهیم کرابۆوە

تیرۆرستێك جەستەی کچۆڵەیەکی ئێزیدی دەبرژاند.

پێم وابوو هەستی بۆنم نەماوە

جیهان بۆتە ڕووباری ناشیرینی و دەمبا

دەمبا و ئیتر جارێکی تر لە باوەشەکاندا بۆنی مێخەکی سینگی ژنان ناکەمەوە..

تا تۆ هاتیت

جانتای شانت بووە سەبەتەکەی مووسا و

لە شێوەی شووشە عەترێك دەربارت کردم.

# متمانە

وەکو دایکێك

چیتر بە ماچ دڵی ئاو ناخواتەوە و

گازی بچووك و بێئەزیەت لە قۆڵی منداڵەکەی دەدات

بەرلەوەی وەڵامی بدەیتەوە، گازێکی بچووك و بێئەزیەت لە قۆڵی ئەو کەسە بدە

دێت و

دەڵێت: خۆشم دەوێی

جاران داپیرەم وای دەکرد

کاتێك کچێکی ناسیاومان هاوسەرگیری دەکرد

گازی لە ئەلقە و گوارە زێڕەکانی دەگرت نەوەك فێڵی لێ کرابێ.

# غەریبیت دەکەم

غەریبیت دەکەم...

مەگەر ئینسان تەنها ئەو کاتەی عاشق دەبێت، بزانێت ئەم ڕستە سواو و زانراوە، ئەم ڕستە باوە، کە لەوەتەی بەشەرەکان فێری قسەکردن بوون بەکاری دێنن، کە لە ملیارەها نامە و ملیارەها پەیوەندیی تەلەفۆنی و یەکتربینیندا هەبووە: چەندە جەرگبڕە..

خەفەتێکە لە هەموو ئاستەکاندا بە دوای دڵدانەوە و سەبووریدا بۆی دەگەڕێن، لە گۆرانییەکی فۆلکلۆرەوە بگرە تا دەگاتە پارچە مۆسیقایەکی مۆزارت، لە بەندێکەوە تا دەگاتە گۆرانییەکی ڕۆك، لە هەقایەتێکەوە تا دەگاتە زانستی فیزیای گەردوونی وکوانتۆم میکانیك..

من بۆ ئەوەی بڕوا بەوە بکەم کە ڕەنگە لە ئاستێکدا لە بیرکردنەوەیەکدا ئەگەری ئەوە هەبێت هەمیشە بەیەکەوە بین، چەندین کتێب و دەیان دیکۆمێنتاری و سەدان بۆچوونی زانایانی بواری کوانتۆم میکانیکم بینیبێت، لە ڕێگەیەوە، چەند ساڵێکە

دەزانم ئەم گەردوونەی ئێمە دەیناسین ڕاستەقینە نییە.. تەنها ئەوە پێنج هەستەکەی ئێمەیە مانا دەداتە شتەکان، بەڵام ئایا خودی شتەکان ئەوەن کە ئێمە دەیانبینین؟

بمبوورە کە دەتبەمە ناو ئەم وردەکارییانەوە کە دڵنیام حەزت لێی نییە، بەڵام ناچارم بڕۆمە ناو کوانتۆم میکانیکەوە، ئەوەی پێی دەڵێن فیزیای نوێ.. ڕاستییەکەی دوای ئەو هەموو ساڵە لە سەرقاڵبوونم بە خوێندنەوەی ئەدەبیاتەوە، بە داخەوە ناچارم بڵێم: ئەو خەیاڵەی لە فیزیادا هەیە هێندە قووڵە، کە لە بەرامبەریدا ئەدەبیات لە قسەی ڕووکەش دەچێت، ئەدەبیات لە چاو فیزیا ورتەورتێکی سۆزدارییە بەرامبەر بە ژیان و گەردوون.. زاناکان ڕاستەکەن، ئەوی بچێتە ناو زانستی فیزیای گەردوونییەوە، بە شێوەیەك کاریگەرە، هەتاهەتایە نابێتەوە بە مرۆڤەکەی پێشوو..

بۆ دڵدانەوەی خۆم بەرامبەر بە ڕستە سواوەکەی: "غەریبیت دەکەم"، زانستی کوانتۆم میکانیك زۆر یارمەتیدەرە، بنەچە و ئەسڵ و پێکهاتەی هەموو شتێك لە گەردوون، بە مرۆڤەوە، بە هەسارەکانەوە، بە هەتاوەکانەوە، بە دار و بەرد و ئۆتۆمبێل و تەنانەت عارەبانەکانی ئیسکانیشەوە، هەمووی بریتییە لە گەردیلە، ئەو گەردیلانەش کۆمەڵێك ئەلیکترۆنیان لەخۆ گرتووە، کێشە ئەوەیە ئەلیکترۆن تا نەبینرێت نازانرێت لە کوێیە و بۆت نییە پرسیار

بکەیت کوا ئەلیکترۆن؟ دەبێتە شەپۆلێك لە ئەگەر و شیمانە.. ئەمە بوو کە پێی دەگوترا کابووسی ئەنشتاین، ئەو زانا مەزنە نەدەچووە عەقڵی پێکهاتەی ئەلیکترۆن تا نەبینرێت بوونی نەبێ، هەمیشە دەیپرسی: ئایا ئەگەر من لە ژوورەوە دانیشم و مانگ نەبینم واتا نییە؟!

دواتر زانست سەلماندی کە بەڵێ مانگ تا نەیبینیت بوونی نییە، یان ئەگەری ئەوەی هەیە هەبێت!

کەواتە ئەلیکترۆن کە پێکهاتەی جەستەی ئینسانیشە تا نەیبینیت نازانرێت لە کوێیە؟ زانست دەڵێ: بەڵێ، بوونی ئینسانیش وەك هەموو شتێکی دیکە ئەگەری ئەوەی هەیە یان نەبێت یاخود ڕەنگە لە هەموو شوێنێکدا هەبێت.. چەند دڵم بەو قسەیەی زانستی کوانتۆم میکانیك خۆشە: تۆ لە هەموو شوێنێکیت.. یان ڕەنگە بوونت نەبێت چونکە ماوەیەکی زۆرە تۆم نەدیوە.. بە هەردوو باریش هەر قازانجمە، لەوانەیە شەپۆلی ئەو ئەلیکترۆنانەی جەستەی تۆیان پێك هێناوە بۆی هەیە یەکانگیر بێت لەگەڵ هەموو شتێکی تر کە من دەیانبینم، هێڵەکانی لەپی دەستت بووبێتە هەمان ئەو نەخشە گەورەیەی سلێمانی کە لە سەرادا هەڵواسراوە، قسەیەکی ناخۆشت بووبێتە هەمان تاسەی سەر جادەی بەردەم دایەنگەیەك تا ئۆتۆمبێلەکان بەناچاری هێواش ببنەوە، قۆڵی هەموو ئەو کراسانەی بەسەر تەنافی ماڵەکاندا هەڵواسراون لە گەردیلەی تۆ بن و سڵاوێك لە من بکەن، ئەو

شەوبۆیەی بەرەبەیانان خۆی گرمۆڵە دەکاتەوە یەکسان بێت بە تۆ، کە سبەینان فێنك دەکات و لەسەر جێگاکەت بە چەرچەفەکەوە خۆت گرمۆڵە دەکەیت..

هەموو شتێك دەبێت بە تۆ و تۆش دەبیت بە هەموو شتێك.

ئەوەی لەو زانستە ئەزیەتم دەدا و خەیاڵم دەشێوێنێت، تەنها زینۆیە، ئەو فەیلەسووفە یۆنانییەی باس لە درێژی دەکات..

زینۆ دەڵێت: هەموو یەکەیەی پێوان دەتوانرێت بۆ هەتاهەتایە دابەش دوو بکرێت، واتا دەتوانین مەتر بکەینە نیوە و هەنگاو بکەینە نیوە و بست بکەینە نیوە و سەنتیمەتر و ملیمەتر و هەتا دوایی، تا دەگەینە پنتێك پێی دەگوترێت: درێژی بلانك کە بچووکترین یەکەی پێوانە و بە بابی میکرۆسکرۆبیش نابینرێت، واتا ئایا من قەت دەگەمە ماڵی ئێوە؟ بە حسێبی بیرکارییانەی زینۆ بێت: قەت ناگەم، چونکە گەر زانستیانە بیر بکەینەوە هەموو ئەو هەنگاوانە بە درێژی بلانك حسێب بکەین، ئەوە من هەتاهەتایە ناتوانم دوو سانتیمەتر لێت بێمە پێش..

بۆیە ئاسانترە، دوای ئەو هەموو سەرئێشەیە، ڕستە سواو و زانراوەکە، ڕستە باوەکە، کە لەوەتەی بەشەرەکان فێری قسەکردن بوون بەکاری دێنن..

بڵێم: غەریبیت دەکەم.

# مێژووی ڕێزمان

لە ماوەی نیوسەدەی ڕابردوودا، نامەکانی خۆشەویستی، زۆربەی جارەکان شیعرێك کۆپلەیەك هیچ نەبێت دیڕێکی نزار قەببانییان تێدابووە، بیرمە لە دەفتەرەکانی پێشووتر گلەیی ئەوەت هەبوو هیچ شیعرێکی ئەو شاعیرە باش و جوانەی لەخۆ نەگرتبوو!

ئەوەتا ئەم جارە چەند کۆپلەیەکت بۆ دەنووسمەوە:

بۆ دەترسیت؟

با کۆتوپێوەند فڕێ دەین، وەکوو دوو ئەسپی بەڕەڵا

وەرە خۆت بە و لەسەر دەفتەری شیعرمدا ڕاکشێ

بێ ترس و منەت، بێ پەروا

من تۆم وەك خۆت دەوێ، لە شێوەی دەقێکی ئازاد

بێ ڕتووش و بێ کێش و سەروا

...

خۆشەویستیت.. ڕووداوێکی مێژووییە لەناو ڕووداوەکانی گەردووندا

زەماوەندی گوڵەکانە و لەرینەوەی گیایە و زانستێکە هەیە و نایەتە بوون

منداڵێکە لەدایك دەبێت و نابێت

هەورەتریشقەیەکە بریسکانەوەی هەیە و نییە

مانگێکە هەڵدێ و نایەت

بەڵام ئەوەی بتناسێت

خۆشی نازانێت ئەو خەمەی لە دڵیدایە چییە؟!

ئەو شەونخوونییە لەچاویدا چییە؟!

...

خۆشەویستیت.. تێکستێکی مسمارییە، ئاشوورییە، فینیقییە، سریانییە، فیرعۆنییە، هیندۆسییە

تێکستێکە لای هەموو شوێنەوارناسەکاندا هەیە و

لە هیچ کتێبێکیشدا نییە!

...

خۆشەویستیت.. کاتێکە لەنێوان شەڕ و ئاشتی

ئێ ئەی جوانترین عیناد، ئەی ئازیزترین سەگباب

بۆ نازانی خراپترین شەڕ بریتییە لە شەڕی ئەعساب؟!

...

خۆشەویستیت.. ملیۆنان پرسیار دروست دەکا و لە شیعردا وەڵامیان دەدۆزێ

خۆشەویستیت شەو قووت دەدا و ڕۆتینی ڕۆژانە دەکرۆژێ

گەر بمەوێ شی بکەمەوە لەناو وشەکاندا بزر دەبم و

بڕوا بکە، مێژووی ڕێزمان دەمکوژێ!

# زوورەکەی "ئیفەرتیتی"ی من

دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵی تر، هەموو ئەوانەی ئێستا لەسەر ئەم هەسارەیە دەژین، ناویان لە تۆماری شەجەرەی بنەماڵەکان نەماوە، لە ڕەگی ئەو شەجەرەیە ناوی دیکە چرۆیان کردووە و ناوی دیکەش بووونەتە لق و گەڵا.. وەکوو فیرعەونەکان ماڵی هەمووومان دوازدە مەترێك کەوتۆتە ژێر خۆڵەوە، بە داخەوە ماڵەکەی تۆش دەکەوێتە ژێر هەولێری دواڕۆژەوە، وەك چۆن گەنجینەکانی ئەسکەندەری مەقدۆنی پێش دوو هەزار و سێ سەد ساڵ کەوتە ژێر قاهیرەی ئێستاوە، وەك چۆن گەنجینەکانی توت عەنخ ئاموون و ژنەکەی حەچپسووت دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوپێش کەوتنە ژێر لمی شاری سەقارەوە.

ڕۆژێك، دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵی تر، دوور لە قەبری من، کە بڕوا ناکەم هێندە بێنێت دوازدە مەتر خۆڵم بۆ هەڵدەنەوە، شوێنەوارناسەکان دەتدۆزنەوە، وەکو موعجیزەیەك جەستە مۆمیانەکراوەکەت دەبینن، ڕاستە کەمێك تۆزی لەسەر نیشتووە، لەو تۆزەی کە هاوینان لە خۆڵی هاتنی من بۆ کۆڵانەکەتان هەڵدەستا کە هێشتا قیر نەکرابوو.

بەڵێ پرچت شێدارە، نەك لەبەر ئەوەی ئەو هەموو سەدەیە لە

شوێنێکی فێنك ڕاکشابوویت، نەخێر، بەڵکوو لەبەر ئەو فرمێسکانەی دوای ئەوەی نائومێد بوون لە بەدەستهێنانت لەسەر دنیا، خۆیان خزاندبووە کارێزەکانەوە و کانی کانی بە شوێنتدا گەڕابوون..

وەکو ژنە فیرعەونێکی نادیار، ژوورەکەت پڕکرابوو لەو شتانەی یارمەتیت دەدەن بە جوانی بمێنیتەوە: لانکێك بۆ ئەو کچەی نەتبوو، کەچی ناوت نابوو هەنار، کەروێشکێکی پەڕۆیینی پەمەیی کە شایەتی ئەو قسانەت بۆ دەدا هی گوتن نین، هەر سێ بەرگی مەحرەمی ڕازی حافزی شیرازی، سینییەك پاقڵاوە کە لە بەیانییەکی زووی سەردەمانێك دروستت کردبوو بۆ یەکەم هاتنی ئازیزەکەت، پەیکەری ئەسپێك کە هەتا مابووی بە تەمای گەیشتنی سوارچاکێك بوویت، تیروکەوانێك کە دیاربوو بە هەڵە دانرابوو، چونکە برژانگەکانت هێشتا وەکوو خۆیان بوون، دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ هێشتا پێویستییان بە ماسکارا نەبوو..

لەسەر دیوارەکاندا نەخشی زۆر هەبوون، بە هێڵکاری وێنەی ماسییەك دەبینرا کەس نەیدەزانی هێندە گریاوە یان لەناو ئاودایە؟ وێنەی چۆلەکەیەك لە ساتی فڕیندا، کە دیاربوو دوو هەزار و پێنج سەد ساڵە دەیویست بێتە سەر شانت. وێنەی مامزێك کە دوای خواردنی بێچووەکەی هیچ دڕندەیەك داوای لێبووردنی لێ نەکرد. وێنەی مارێك تا کەس نزیکت نەبێتەوە. وێنەی کلیلێك دیارە زانراوە دەرگای بەختەوەریت ون کردووە..

لە ژوورسەریشت یەك دێڕ شیعر هەبوو، دێڕێك و بەس:

*لەناو ئاودا، کێ شایەتی بۆ فرمێسکی ماسی دەدا؟!*

# گرینۆک

هاوڕێیەکم هەبوو ژنێکی خۆش ویست، ئەو هاوڕێیەم لەگەڵ ئەوەی جوان و زیرەك و کەسایەتییەکی درەوشاوەی هەبوو، تەنها یەك عەیبی هەبوو کە لە قسەکردندا بەرامبەرەکەی بێزار دەکرد، ئەگەر زۆر دڵنیا نەبام لەوەی تەنها ئەو چیرۆکەی بۆ من گێڕاوەتەوە، ئەوا دەمگوت نووسەری ناوداری ئەمریکای لاتین دیگۆ مینیۆز بالینزوێلا لە چایخانەکەی مام خەلیل لە قەیسەریی هەولێر، لە سەدەی ڕابردوو ئەو هاوڕێیەمی ناسیوە و چیرۆکی (گەڕاندنەوەی بایەخ)ی نووسیوە:

(خاتوو سێرسی جوان هەستی بە بێزاری دەکرد لە گەمژەیی ئۆدیسیۆس، لەگەڵ ئەوەی ئۆدیسیۆس پیاوێکی جوان و وریا و مەرد بوو، بەڵام ژیان لەگەڵیدا هیچ چێژێکی نەمابوو.

ئەو کاتەی ئۆدیسیۆس قسەی دەکرد و بۆ لێخۆشبوون دەگریا و دەنووزایەوە، سێرسی جوان بێزار دەبوو، دەیگۆڕی بۆ سەگێك و

بە نووکە پێ دووری دەخستەوە، جارێك كردی بە ئەسپ و بەدرێژایی شارەکە هاتوچۆی پێ دەکرد و بە قامچی لێی دەدا، جارێك دەیگۆڕی بۆ مەڕێك و بە زەلیلی کا و جۆی دەدایە.. دواتر دەیکردەوە بە مرۆڤ و لەگەڵی دەخەوت. دوای قسەکردن و شێوازە بێزارکەرەکەی دیسان سێرسی جوان تووڕە دەبۆوە.. بۆیە بڕیاری دا بە یەکجاری ئۆدیسیۆس لە مەملەکەتی خۆی دەربکات.. کەشتییەکی پێ دا و پڕی کرد لە هەرچی پێویستییە بۆ سەفەرێك کە زۆر زۆری دەخایاند، فڕێی دایە ناو کەشتییەکە و سێرسی جوان بە دەنگێکی یەکلاکەرەوە گوتی: ئەی موسافیری گرینۆك، بڕۆ و قەت نەیەیتەوە .. چ چیرۆکێکت پێ خۆشە بۆ خەڵکی بگێڕەوە، تا لە مێژوودا بە جوانی دەربکەویت.

پاش ئەوە بایەکی ئەفسووناوی هەڵی کرد و کەشتی لە چاواندا بزر کرد).

# ئەوە منم بەڵام خۆم نیم

با چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە.. ئەمە یەکێکە لە سیناریۆ بڵاونەکراوەکانی گارسیا مارکیز، تەنها بۆ ئەوەی بزانیت من دەمویست لە ژیانی تۆدا کام کەسایەتییە بم...

ژنێکی تەمەن پەنجا و پێنج ساڵ لە ماڵێکی ئارام و خانەداندا دەژی، کەسێکی سەرکەوتووە و منداڵەکانی دکتۆرن و ژنیان هێناوە و ساڵێك دەبێت مێردەکەی مردووە، وەکوو یادگاریی منداڵی و گەنجێتی خۆی، هاتۆتەوە ماڵی باوکی و کورەکانی خانووەکەیان بۆ تازە کردۆتەوە.. ڕۆژێك پیکابی فەرمانگەی پۆستە و نامە لەبەر دەرگایان دەوەستێ و ئەو سندووقە دارەی بۆ نامە دانراوە بە مەبەستی تازەکردنەوە دەبەن.. ڕۆژی دواتر فەرمانبەرێك دێتەوە و لە دەرگا دەدات، ژنەکە دەرگا دەکاتەوە و فەرمانبەرەکە دەڵێت: خاتوون ئەم نامەیە لەناو سندووقی نامەکانی ئێوەدا بەجێ مابوو، کەوتبووە دیوی سەرەوەی سندووقەکەوە بۆیە پێتان نەزانیوە، ژنەکە سوپاسی دەکات و لەگەڵ یەکەم سەیرکردنی زەرفی نامەکە لێدانی دڵی خێرا دەبێت، نامەکە هی سی و پێنج ساڵ لەمەوپێشە،

پێش سی و پێنج ساڵ ئەم ژنە کوڕێکی شاعیری ناسیوە و یەکتریان خۆش ویستووە، بۆ یەك گریاون، کوڕەکە لەبەر خاتری ئەو خۆی فێرە ژەنینی ئامێری کەمانچە کردبوو و شەوان لەبەر پەنجەرەیکەیدا فالسە گرینۆکەکانی دەژەنی، بەڵام هەژار و کەمدەرامەت بوون، باوکی نەمابوو، دایکی بە جلشۆرینی ماڵان و نانکردن بۆ دراوسێکان دەیژیاند.. بۆنی گۆشتی برژاوییان تەنها لە ماڵە دراوسێکانەوە دەکرد، میوەیان تەنها لەو تابلۆ زەیتییەدا دەبینی کە هاوڕێیەکی شێوەکاری بە دیاری پێی دایوو، لە دارەتی دنیا تەنها دوو گیرفانی بەتاڵ و دڵێکی پڕی شك دەبرد، دەمێکی وشك و دوو چاوی تەڕی شك دەبرد. ئێوارەیەك پێی لە جەرگی خۆی نا، بەسەر کاشیی ئەو مەمەڕەی دەتگوت شەترەنجە چووە بەردەم باوکی کچە و گوتی بمکە بە بەختەوەرترین هەژاری ئەم شارە و داوای دەستی کچەکەی کرد.. باوکی کچە زۆر بەخراپی کردییە دەرەوە و ئەویش وەکوو بازە خوارەکانی فیل لەسەر شەترەنج بەنائومێدی گەڕایەوە، کچەش خۆی لە ژوورەکەی بەند کرد و زاد نەچووە دەمییەوە، باوکی زۆر هەوڵی دا تێی بگەیەنێت کە ئەو کوڕە ئایندەی نییە و لەناو خەیاڵەکانیدا دەژی، هی ئەوە نییە ماڵ بەڕێوە ببات و ئەویش ئامادە نییە کچە تاقانەکەی تووشی ئەو چارەنووسە بکات، زۆر هانی دا شوو بەو کوڕە بکات کە لە پزیشکی دەخوێنێت و لە سایەیدا دەحەسێتەوە و چەند جارێکیش داوای کردووە. کچەکە پەیمان دەداتە کوڕەی شاعیر و پلان دادەنێن بەیەکەوە ڕاکەن، دوور لە چاوی باوکی و لە شارێکی تر هاوسەرگیری بکەن، کات دادەنێن ڕۆژی

چوارشەممەی داهاتوو کاتژمێر پێنجی ئێوارە لە گەراجی پاسەکاندا یەکتر ببینن و بۆ هەتاهەتایە بەیەکەوە بن..

کچە ڕۆژی چوارشەم کاتژمێر پێنج لە گەراج دەبێت و کوڕەکە نایەت.. دنیا تاریك دادێت و کوڕە نایەت.. لە گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە هەموو ئەو قسانەی باوکی بیر دەکەوێتەوە کە ئەو کوڕە شایستەی ئەوە نییە چارەنووسی خۆی لەگەڵدا ببەستێتەوە. دێتەوە ماڵ و بە باوکی دەڵێت ڕازییە شوو بە دکتۆرەکە بکات بەو مەرجەی بە زووترین کات بگوازرێتەوە و بڕۆنە شارێکی تر، ڕۆژی دواتر شوو بە دکتۆرەکە دەکات و بۆ دوورکەوتنەوە دەڕۆنە شارێکی تر، کچە ژیانێکی باش و ئاسوودە دەژی و منداڵی دەبێت و چیرۆکی خۆشەویستییەکەی وەکوو یادەوەرییەکی ناخۆش لە کونجێکی ناخیدا دەشارێتەوە، بەدرێژایی ژیانیشی بۆ منداڵەکانی، بۆ هاوڕێکانی باس لەوە دەکات عەشقی ڕاستەقینە بوونی نییە و ئەوانەی خۆشمان دەوێن تەنها ئەو کەسانەن کە باش نەمانناسین و تێر لەگەڵیاندا نەژیاین، دەنا ئەوانیش لە لامان دەبوونەوە کەسی ئاسایی.. ئەم بڕوایەی درێژەی کێشا تا بە دەستێکی لەرزۆکەوە نامە بەجێماوەکەی سی و پێنج ساڵ لەمەوپێشی ناو سندووقەکەی کردەوە کە نووسراوە:

(ئازیزم من ئەمڕۆ دایکم مرد، کاتەکە دەخەینە هەفتەی داهاتوو/ چوارشەممە کاترمێر پێنجی ئێوارە.. خۆشم دەوێی جەرگم..)

بیری کەوتەوە کە سبەی چوارشەممەیە، شەو تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت، هەموو ئەو جنێوانەی بیرکەوتەوە کە بەو کوڕە شاعیرە بەستەزمانەی داوە، درەنگ لە پووچیی هەموو ئەو قسە نەستەق و پەند و وتانە گەیشت کە لەبارەی خراپیی مرۆڤەکانەوە کۆی کردبوونەوە. کە پەرداخێك دەشکا وایدەزانی خەتای ئەوە، کە کارەبا دەبڕا وای دەزانی هەر ئەوە دنیا تاریك دەکا، کە پەنجەیەکی لە بڕینەوەی لقە دارێکی باخچەکە بریندار دەبوو، پێی وابوو ئەو کوڕە بنەچەی ڕووەکی سەببار بووە و هەموو لەشی دڕکاوییە.. تا بەیانی گریا.. نەخوێندنەوەی نامەیەك بووە مایەی ئەوەی چەند منداڵێکی لە پیاوێك ببێت کە خۆشی نەدەویست.. نەخوێندەنەوەی نامەیەك بووە مایەی گێڕانەوەی ئەو هەموو چیرۆکە بۆ منداڵەکانی لەبارەی غەدر و جێهێشتن و ماڵئاواییەوە..

ڕۆژی دواتر قژە ڕەنگ فافۆنییەکەی شانە کرد و سەعات پێنجی ئێوارە چووە گەراجی پاسەکان و بینی کوڕەی شاعیر بە هەمان جلی سی و پێنج ساڵ لەمەوپێش، لە هەمان شوێنی سی و پێنج ساڵ لەمەوپێش وەستاوە و چاوەڕێی دەکات.. سی و پێنج ساڵە هەموو چوارشەممەیەك سەعات پێنجی ئێوارە چاوەڕێی دەکات. سڵاوی کرد و تەماشای یەکتریان کرد، هەموو شتێك هی جاران بوو، هەناسەی تەنگ و لێوی لەرزۆك و بریسکانەوی چاو، تەنها سێ شت لە ماوەی ئەو سی و پێنج ساڵەدا زیادی کردبوو، سپێتی لە قژیان و عەینەك لە چاویان و لە دڵیاندا خۆشەویستی.

# یەک سەرەتا و چەندین کۆتایی

قەت حەزم نەکردووە لە باڵەخانەیەك خۆم فڕێ بدەمە خوارەوە، ئەو باڵەخانەیە ئەگەر زەمەن بووایە بێگومان خۆم فڕێ دەدا، بەرەو ڕابردوو، بەرەو ڕۆژی لەدایکبوونت..

زانیارییەکانی ئەو ڕۆژەم کۆ دەکردەوە، مانشێتی ڕۆژنامەکان، ئەو گۆرانییانەی باو بوون، ئەو ئەلقە تەلەفزیۆنییەی ژنەکان بە دیارییەوە گوڵەبەڕۆژەیان دەخوارد، ئەو گەڕەکانەی هێشتا دروست نەکرابوون، ئەو شەقامانەی دواتر قیرپان ناسی و عاشقەکان ناچار بوون بە ناو قوڕدا بەرەو ماڵی یارەکانیان بڕۆن، ئەو مزگەوتانەی موکەبیرەیان نەبوو، چونکە هیچ کەسێك بزر نەدەبوو تا بانگەواز بۆ دۆزینەوەی بکرێت..

وێنا دەکەم لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ناوەڕاستی نۆڤەمبەر، لە ساڵێك لە ساڵەکانی خوا لەدایك بووبیت.

لای زۆرێك لە شاعیرانم خوێندۆتەوە کە لە مانگی نۆڤەمبەردا لەبەر ئاگردان و کەشی باراناوی هۆنراوەیان بۆ خۆشەویستەکانیان

هۆنیوەتەوە، بابلۆ نیرۆدا، نزار قەبانی، لۆرکا، نازم حیکمەت، سەیاب و زۆری تر.. تۆش لە مانگی نۆڤەمبەر لەدایك بە، بۆ ئەوەی گەر منیش نەتوانم هەقی جوانیت بدەم، ئەوا دڵخۆش بم بەوەی ئەو برادەرانە بە واجبی میهرەبانیت هەستاون.

لەپێش چاومە، لە گوندێکی دوور، مەلۆتکەیەکی جوانیت، لە تەنیشت دایکتەوە ڕاکشاویت، بێ یادەوەریت و جار جارە لێوت بەو یەکدوو قەترە شەکراوە دەبزوێ کە دەڵێی قەرەبوویەکی زووە بۆ ئەو تاڵییانەی لە گەشتە نایابەکەی ژیاندا تامیان دەکەیت، قورئانێك لەژێر سەرتایە و باوکت جگەرەیەك بە داری ناو زۆپاکە دادەگیرسێنێ و بیر لە دۆزینەوەی ناوێکی خۆش دەکاتەوە، لە ناودا هەمیشە خەڵکی کوێستانی یەکەمین شت خەیاڵی بۆ لای میوە دەچێت: هەنار، لیمۆ، ترێ..

بە داخەوە لێرەدا من تەنها حیکایەتخوانم و لە دەرگای ژوورەکە وەستاوم و تەماشا دەکەم، دەنا بە باوکتم دەگوت: سیبیل.. ناوی بنێ سیبیل.

سیبیل لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا بەتەمەنترین ژنی دنیایە، داوای تەمەنی ئەبەدی دەکا و وەك سزایەك پێی دەبەخشرێت، چارەنووسیشی لەگەڵ بێزاری و گازاندەکانت بەرامبەر بە دنیای ئێستات دەگونجێ.

سیبیل بە دایکی گەورە ناو دەبرێت، هێندە بە تەمەن ببوو بەقەد منداڵێکی ساوا بچووك بچووك ببۆوە، لە کۆتایی تەمەنیدا لەناو تورەگەیەکیان نابوو، لە هەیواندا هەڵیانواسیبوو، تەنانەت کاتێك منداڵەکان لە کۆڵاندا یارییان دەکرد و بە هەرا و پێکەنینەوە دەیانپرسی:

- چیت دەوێ سیبیل؟

- بە نووزەیەکی نزم، زۆر نزم، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: دەمەوێ بمرم!

پێ دەچێت ئەم هەسارەیەش کە توحفەیەکی نازدار بوو، تەمەنی گەیشتۆتە چوار ملیار و هەشت سەد ملیۆن ساڵ، لە شێوەی سیبیل لەو تەمەنە درێژەی ناهەقییەکان بێزار بووبێ و گەر کەسێك زمانی گەردوون بزانێت و بپرسێت: چیت دەوێ زەوی؟

ئەوا لە ڕێگەی بوومەلەرزەیەکی نزم، زۆر نزم لەبەرخۆیەوە بڵێت: دەمەوێ بمرم!

من نازانم ڕۆژی لەدایکبوونت چەند شەممە بوو؟

خۆزگە هەینی دەبوو، لەو ڕۆژەدا بڵندگۆی هەموو مزگەوتەکان بەیەکەوە لەسەر مەقامی بەیات بەیەکەوە هاوار دەکەن: خودا گەورەیە و جوانیی خۆش دەوێ.

خۆزگە شەممە دەبوو: بەپێی سفری تەکوین، لەو ڕۆژەدا خودا لە دروستکردنی گەردوون بۆوە و ئیسراحەتی کرد.

یان یەکشەممە دەبوو: تیایدا مەسیح لە مردن هەستایەوە و تۆی وەك نوێنەری میهرەبانی جێ هێشت و چووە ئاسمان.

بریا دووشەممە دەبوو: بەپێی ئەفسانە ئایینییەکان لەو ڕۆژەدا ئاو و وشکایی دروست کران، کیشوەر و دورگە و کەنداوی لێ کەوتەوە، وشکایی وەك ناخی من و ئاویش وەکوو بریسکانەوەی ئەو دڵوپە شەکراوەی ئەو ڕۆژە ناوبەناو لێوی تۆیان پێ تەڕ دەکرد.

بریا سێشەممە دەبوو: لای عەرەبە کۆنەکان بە ڕۆژی ئەلقە ناو دەبرا، چونکە وەك ئەلقەیەك سەرەتا و کۆتایی هەفتەی بەیەکەوە گرێ دەدا، ئەم ڕۆژە بۆ لەدایکبوونت گونجاوە، چونکە وەك ئەلقەیەك منت بە دنیا گرێدایەوە.

بریا چوارشەممە دەبوو: لای ئێزیدییەکان ڕۆژی هاتنە خوارەوەی ئادەم و حەوایە بۆ لالش، ڕۆژی ئۆدینی خواوەندی گەورەی ئیسکەندەنافییەکانە، ڕۆژی میرکۆرییە، خواوەندی هەیبەت و سەفەر و زانست لای ڕۆمانییەکان، ڕۆژی لەدایکبوونی زەردەشتە، ڕۆژی هاتنی دایکانە بۆ بینینی ڕۆڵەکانیان لە بەندیخانە، ئەوان پارچە شفتە و پاکەتی جگەرە و نانی تیرییان لە بوخچەیەکدا هەڵگرتووە و

منیش بۆ تۆ لەتە غەزەل و قوتووی گۆرانی و سڵاوی شیرین لە دەفتەرێکدا.

خۆزگە پێنجشەممە دەبوو: لای فیرعەونییەکان ڕۆژی شوشتنی زەوی بوو لە لایەن خواوەندی هەتاوەوە، ڕۆژی شوشتنی منیش بوو بە گڵەسەر و لیفکە زبرەکەی دایکمەوە، لە ڕۆمای کۆن ڕۆژی هەسارەی موشتەرییە، گەورەترین هەسارەی کۆمەڵەی خۆری ئێمە، ئەم ڕۆژەش بۆ تۆ شیاوە کە ببیتە گەورەترین کەسی کۆمەڵەی ئازیزانی من.

## باشم باش

ئای لە ئازاری پشت ئەم دوو وشەیە..

کاتێك لە وەڵامی نامەیەکدا هەزاران قسە لە دڵتدایە و

تەنها دەنووسیت: من باشم..

# بیردەکەینەوە کە چۆن بیر لە یەکتر نەکەینەوە

بە منداڵی میزەڵانێکمان دەهێنا و پڕ ئاومان دەکرد، دواتر بە قەڵەمی ڕەنگ دوو ناومان دوور لەیەکتر دەنووسی، کە ئاوەکەمان بەتاڵ دەکرد، ناوەکان دەهاتنەوە تەنیشت یەکتر..

وا هەست دەکەم لەگەڵ تۆشدا ئەو یارییەم کردبێ، ئەوکات ناوی خۆم و خۆتم لەسەر میزەڵانێك نووسیوە، بەڵام لەجیاتیی ئاو دەمانویست پڕ شنەبا و بۆنی گیا و تریفەی مانگ و قسەی جوانی بکەین، وتەی ناودارانمان لەبارەی عەشقەوە کۆ دەکردەوە، شەوان لەسەر پشت بەرامبەر بە مانگ بیرمان لەیەکتر دەکردەوە و تریفەمان دەکردە چەپك، من لە مەخموور کوارگ و دۆمبەڵانم کۆ دەکردەوە و تۆش لە کوێستانی باڵەکایەتی بەو قەڵەمبڕەی بڕیار بوو ناووکی یەکەم منداڵی خۆمانی پێ ببڕیت، بە دوای بنجە تۆڵەکە و نۆبەرەی کنگردا دەگەڕایت، بۆنی گیامان دەخستە کووپەی یادەوەرییەوە..

ڕەشەبای ڕۆژگار هات، هیچ شتێکی لە شوێنی خۆیدا نەهێشت. زاڵمەکانی دین و زاڵمەکانی سیاسەت و زاڵمەکانی

خواردن و زاڵمەکانی دەرمان پەیدا بوون، دروشمەکان بوونە درۆ و ڕیکلام شوێنی گرتنەوە، بڕوابوون بە خۆشەویستی و وەفا و مەردایەتی و هەق، بوونە جۆرێك لە جۆرەکانی ڕۆمانسییەت و گەمژەیی، ئەم توحفەیەی ناوی زەوییە دابەش کرا بەسەر کۆمەڵێك بازرگانەوە، وردەوردە ئاژەڵەکان خرانە باخچەکانەوە و مرۆڤەکانیش کرانە پاسەوان، پاسەوانی دەوڵەت و ئایدۆلۆژیا کە بێجگە لە فاشییەت ناتوانن هیچی دیکە بەرهەم بێنن، دەرمانی گەچ و ڤایرۆسی سەیر و شەکری سناعی و خوێی بێتام و بەشەری بێتامی لێ کەوتەوە، بووە ڕاکەڕاك و کاتی چێژی بیرکردنەوە نەما..

ئەو ڕۆژگارە نەك خەباتگێڕ و بازرگان و ڕۆشنبیر و نووسەرەکان، تەنانەت سواڵکەرەکانی سەرجادەش فێری تەکنیکی نوێی درۆکردن کرد..

بەڵێ ئاریزم، ڕەشەبای ئەو ژیانە فەیکە هات و میزەڵانی ئێمەیان پڕ فێڵ و درۆ کرد، ئێستا ئەو میزەڵانە هێندە پڕبووە بۆتە هەسارەی زەوی، تازە بەتاڵیش نابێتەوە تا ناوی هەردووکمان بێتەوە تەنیشت یەکتر..

هەر یەکەمان لە شوێنێکدا دوور لەیەکتر دانیشتووین و بیر دەکەینەوە کە چۆن بیر لە یەکتر نەکەینەوە.

# چارەنووس

بە قەراری کلارنێتێك بە نزمی دانی پیادەنێم، دەستم لەوە هەڵگرت لەم ژیانەمدا بەیەکەوە بین..

بۆ کوێ دەچی، دوای ملیۆنان ساڵی تر کاتێك مرۆڤەکان دەبنەوە وزە و تێکەڵ بە سروشت دەبنەوە، هیوادارم من نەبم بە نەوت..

خۆ ئەگەر نەبمە چیلکەدارێك ئاراستەی ئاوی جۆگەلەیەك بەرەو مامزێکی بریندار بگۆڕێت.

ئەگەر نەبمە گۆرانییەك لەنێوان دوو کەس کە ڕۆحیان دەگۆڕنەوە بۆ نامەیەك و غروریان ڕێگە نادا سڵاوێك بنێرن..

ئەگەر نەبمە دوعایەك کە شەکر بە مردنە کتوپڕەکان دادەکا..

ئەگەر نەبمە ئەو شێتەی دوایین بەردی لە دەستە و لە جیهانی دەگرێت..

هیوادارم دوای سەدان پشت ببمە هەرمێیەکی تورت و یەکێك

لە نەوەی نەوەکانت لە سندوقی ناو پیکابێکی میوەدا دەست بگێڕێ و هەڵم بژێرێ.

# ئەو گوڵەگەنمانەی بوونە گسک

جان پۆل سارتەر نووسەر و بیرمەندی دیار، کتێبێکی لەبارەی شاعیری ناوازە شارل بۆدلێرەوە هەیە، لەوێدا بەم شێوەیە باس لە بۆدلێر دەکات: "بۆدلێر هەستی دەکرد کۆترێکی سپییە لەناو قەلەڕەشەکاندا، ئەو بە تەنهایە و قەلەڕەشەکانیش زۆرینەن، بۆ دڵدانەوەی خۆی تەنها توانیویەتی سەیری باڵە سپییەکانی خۆی بکات و هەست بە جیاوازی بکات، چونکە تەنهاشە نەك کەس ڕێزی ناگرێت، بەڵکوو قەلەڕەشەکان بە ڕەنگێکی نامۆ و نابووتی دەزانن، کێشە ئەوەیە بۆدلێر کۆترێکی کوێرە، واتا دەزانێت باڵی سپییە و بەڵگەشی پێ نییە، دەزانێ جیاوازە و ناشتوانێ بیسەلمێنێ. ئەو هەستکردنە بە نەفیکردن و فڕینەی لە دەرەوەی پۆلدا، کرۆکی شیعری بۆدلێرە، تا لە کۆتاییدا هەر بەو حەسرەتە سەردەنێتەوە کە کەس نەبوو شایەتی باڵ و ڕۆحە سپییەکەی بۆ بدات.."

ئەو جۆرە لە غوربەت، سیمای مرۆڤایەتی بووە، هەر یەکەمان لە تەمەنێکدا، لە ئینتیمایەکدا، لەپەیوەندییەکەتدا هەستمان کردووە گوڵەگەنمین، بە پیرۆزیی بیرۆکەیەك گەشاوینەتەوە، بە شنەی تەندروستیی باشەوە لەریوینەتەوە، بە پەیوەندییەکی

دۆستانەوە چاومان لە خۆشیاندا بریسکاوەتەوە، وردەوردە زەمەن و تەمەن پارچەپارچە لەو پاکییەی ناخت دەبەن و هەست بە زیادەیی دەکەیت، هەست دەکەیت جیا لە هەمووان شوێنێکت لە جیهان نەگرتووە، نەبوویت بەوەی ئومێدت بوو ببیت، من مەجلیسم دیوە باوکە پیرەکە لە گیانەڵادا بوو لە ژوورەکەی تەنیشتییەوە، کوڕەکانی مشتومڕی دابەشکردنی میراتەکەی بوون، بینیم هەموو شتێکیان دابەش کرد و تەنها مردنەکەیان بۆ خۆی بەجێ هێشت، بینیم ئەو باوکە پیرەی ڕۆژێك لە ڕۆژان گوڵەگەنم بوو، چۆن بۆتە گسك و تۆز و غوباری مردن کۆ دەکاتەوە!

بینیومە ئەو پێشمەرگە کۆنەی بڕنۆکەی بە دیواری ژووری میواندا هەڵواسیوە چۆن بە چاوی حەسرەتەوە باسی بەگسکبوونی خۆی دەکات و ئێستا وردە مەراقەکانی هەڤاڵە کۆنەکانی کۆ دەکاتەوە. مرۆڤ لە سەرەتاوە هەست دەکات خۆی سەنتەری دنیایە و چەقی زیندوێتیی دنیا لە ترپەی دڵی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێت، بەرەبەرە مردنی ئازیزان و خیانەتی نیشتیمانی و خیانەتی خودی جەستەی خۆشی دەبێنێت، کلۆریی ددان و سپیبوونی موو و لەکارکەوتنی پەنکریاس و خزانی فەقەرات و وشکبوونەوەی سابوونی ئەژنۆی دەبینێت و دەزانێت نەك سەنتەری دنیا نەبوو، بەڵکوو لە پەراوێزی ژیانکردنیشەوە فاریزەی جیاکردنەوەی مان و نەمانیش نەبوو!

گوڵەگەنم بووین: ئەوکاتەی هەستمان بە گەرمیی ژیان دەکرد..

وەکو گەرمایی پشتی پیرەمێردێك لەسەر کوشینی پاسێك.

# عەبدوڵڵا گوێ بە گوارە

هەموو دایکەکان منداڵەکانیان بەو پیاوە دەترساند، ساواکانیان بەو پیاوە دەخەواند، گەنجەکانیش تیایدابوو بە نەزۆك و هەشبوو بە منداڵبازیان دەزانی.

عەبدوڵڵا گوێ بە گوارە پیاوێکی چل ساڵەی ئەسمەری باڵابەرز بوو، دەست و ناولەپی ڕەش ڕەش بوو، پرچێکی زۆر درێژتری لەو ژنانەی هەبوو کە سبەینانی پێنجشەممان لە بەردەم حەمام قەرەچووغ دەمانبینین، لەژێر ئەو پرچە درێژەیدا کە بە هەوای لێخوڕینی پایسکلە بێ قایشقوڕەکەی دەلەرییەوە: دوو گوارەی زێڕی عەیار تۆقێنەر دەبریسکانەوە.

لە گەڕەکێکی وەك "کوران"ی ئەوسا کە ئەگەر کەسێك لەدووریی سەد مەترەوە بپژمیبا حەفتا کەس لە لایەن خۆیانەوە دەیانگوت: خودا ڕەحم بە ئێمە و مردووەکانمان بکات، ئەستەم بوو پیاوێکی گوێ بە گوارە حسێبی کافرێکی زەمانی جاهیلیشی بۆ بکرێت، ڕاستییش خەڵکی کوران نەبوو، ژوورێکی لای پیرێژنێك بە کرێ گرتبوو

لە کۆڵانی گەنمفرۆشان، بەبێدەنگی سبەینان دەڕۆیشت و ئێواران دەهاتەوە، نەمانبینی ڕۆژێك سڵاوێك لە کەسێك بکات، تەنیا و بێکەس دەژیا، تەنانەت سەرەتا وامان دەزانی کەڕ و لاڵە، تا ئەو پیرێژنەی خاوەن خانووەکە درکاندی کە جار جارە بیستوویەتی بە دەنگێکی نزم لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەڵێت، نەمانبینی بێتە پرسەیەك، یان هیچ نەبێت دوو شیش علێوە لای دوکانەکەی مام سەید بخوات.. مەلای گەڕەك بۆچوونی وابوو کە جنۆکەکان خواردنی بۆ دێنن، کاتێك پیرەمێردەکانیش دەیانپرسی خواردنی جنۆکەکان چییە مامۆستا؟ ئەویش بە نەبرەی کەسێك کە خزمایەتی لەگەڵ حەنبەلییەکان هەبێت، دەیگوت: قاچی بەرازە لەناو تێزاب دەیکوڵێنن، بەڵام مشتێك ساواریشی تێ دەکەن.

ئەو کەسانەی شەوان درەنگ تانکی ئاوی سەربانیان پڕ دەکرد، سوێندیان دەخوارد کە بیستوویانە پایدەری پایسکلەکە لەخۆڕا زنجیرەکەی سووڕاندۆتەوە، ئەو عاشقانەی لە شەوە بێ مانگەکاندا دەچوونە ژووانی یارەکانیان سەربان و سەربان بازیان دەدا دەیانگوت بینیومانە دەستە بە تاوان ڕەشبووەکەی وەکو دوو چرا شەوقیان داوەتەوە..

ئێوارەیەك پیرەمێردەکان لەبەردەم مزگەوتدا دامەیان نەکرد و بڕیاریان دا چەند گەنجێك بە دوای ئەو گوێ بە گوارەیە بنێرن بزانن

ئەبو جەهل سبەینان بۆ کوێ دەچێت و چ کارەیە؟!

بۆ ئەمەش دەبووایە یەکدوو کەسی وەرزشوان هەڵبژێرن، چونکە ڕاکردن بە دوای پایسکلسوارێکدا بە وتەی پیرەمێردەکان خۆیان: کەسێکی دەوێ ڕیخۆڵەی نەبێت.

بۆ ئەم ئەرکە ئیمانییە من و سەعەیان هەڵبژارد، سبەینەی ڕۆژی دواتر عەبدوڵلا گوێ بە گوارە هەستایە سەر پەیدان و ئێمەش بە دوایدا، ئەوەی باش بوو زوو زوو تایمی سوکانی پایسکلەکەی تێك دەچوو کە ئێمە بە هەناسەی سوارەوە پێمان وابوو بە هۆی گوناهە زۆرەکانیەتی، جار جارەش بە پێکەنینەوەوە دەمانگوت نا، ئەوە بە هۆی کێشی زیادەی گوارە و پرچە درێژەکەیەتی. ئەو کافرە ناچار بوو بوەستێ و دابەزێ و تایەکە بخاتە ناو لینگییەوە و تایمی سوکانەکە بداتەوە، دەنا هەر بە ڕاستی ڕیخۆڵەی دەپساندین..

مردین هەتا گەیشتینە تەیراوە، دەڕابی دوکانێکی دیوار ڕەشی کردەوە، لە بەرامبەریدا خۆمان لەتەنیشت ئەو عەرەبانەیە شاردەوە کە لۆبیا و نۆکی دەفرۆشت، دنیایەك زۆپا و پرێمز و غازی سێ پایە و تەباخی بچووکی فتیلەدار لە دوکانە تاریکەکەیدا بەسەر یەکدا هەڵچنرابوون، بە خەتێکی جوان لەسەر کارتۆنێکی هەڵواسراوی سەر دیوار نووسرابوو: "بۆ چاککردنەوەی هەموو زۆپا

و تەباخێك، بە تەنها چاككردنەوەی پرێمز بەخۆڕاییە".

هاتە بەردەم دوكانەكە و بە دەنگێكی خۆش، كە یەكەم جار بوو بیبیستین بانگی كردین: وەرن..

ویستمان ڕاكەین و گوتی: دەڵێم وەرن.

بە لەرزەوە لەو پیاوە پرچدرێژە دەستڕەشە گوێ بە گوارەیە نزیك بووینەوە، نەوێراین بچینە ناوەوە و لەسەر بلۆكە ڕەشهەڵگەڕاوەكانی بەردەم دوكانەكە گرمۆڵە بووین، سوراحییەك ئاوی هێنا و بەبێ ئەوەی بزانین لە ترسانە یان هیلاكی، ئاومان خواردەوە، یەكێك لە تەباخەكانی داگیرساند و قۆرییە بە تەنی و سوتووەكەی چای لەسەر دانا، چووە ئەوبەر لەسەر كاغەزێكدا كە دیاربوو كتێبی پەروەردەی نیشتمانییە، هەندێك نۆك و لۆبیای هێنا و لە تەنیشتمان دانیشت، من یەكسەر ئارام بوومەوە كە لەسەر زۆپایەكی شكاودا بینیم كتێبی (احبك والبقیة تاتی)ی نزار قەببانی دانراوە، نەشمزانی گوێی لێمە كاتێك لەبەر خۆمەوە گوتم: ئەوەی شیعری نزار قەببانی بخوات، پێویستی بە خواردنی جنۆكان نییە، تەماشای كردم و گوتی: چما دەڵێن خواردنی جنۆكەكان دەخۆم؟!

دەركەوت نەك هەر ئێمەی دیوە، بەڵكوو لەبەر خاتری ئێمە زوو زوو وەستاوە و لە پایسكلەكەی دابەزیوە، ئیتر لە سەرەتاوە

هەمووومان بۆ گێڕایەوە، هەرچی گوتراوە و هەڵچنراوە..

بە خەندەی تاڵی ئەو کەسانەی لە دووریی ڕاهاتوون گوتی: بۆ ئەوەی ئەو هەموو ڕاکردنەی ئەمڕۆتان بە خەسار نەچێت، هەندێك نۆك و لۆبیا بخۆن و چایەك بخۆنەوە و بڕۆنەوە، بە پلکە نەجاتیش بڵێن من چیتر نایەمەوە ئەو ماڵە و ئەو یاتاغە کۆنەی تێشیدایە گەردنی ئازاد بێت..

بۆ کرێی پاس یەکەو درهەمێکی خستە ناو لەپمانەوە، ویستمان قسەیەك بکەین، پەنجەی شایەتمانەی لەسەر دەم دانا..

ڕۆیشتین یەکدوو هەنگاو و ئاوڕم دایەوە و پرسیم: لەبەر خاتری هیلاکیمان نا، لەبەر خاتری کتێبی (احبك والبقية تاتي)، پێم بڵێ ئەو گوارەیە چییە؟!

بە دەنگی مرۆڤێك کە تا ئەم ساتە لەو مرۆڤترم نەدیوە، گوتی:

گوارەی خێزانەکەمە، بە پرێمز سووتا...!

## ئەربائیلۆ

ئەو سڵاوانەی نەمانکرد

ئەو شەوشادانەی لەبەر خۆمانەوە گوتمان و بەربوونەوە

دوای هەزاران هەزار ساڵی تر شوێنەوارناسەکان دێن و

ئێسقانی وشەکانمان دەدۆزنەوە

تێدەگەن ئەم وڵاتە مەیدانی چ بەشەڕێکی دڵڕەق بووە!

## ئەو کچەی لە ئاسمان هاتەوە

گێڕانەوەی بەسەرهات لە هەڵوەشاندنەوەی فانیلەیەکی سووف دەچێت، بۆ ئەوەی ئاڵۆز نەبێت پێویستە لە سەرەتاوە دەزووە ڕاستەکە بگریت..

هەر یەکە و لە لای خۆیەوە هێندە دەزووی بەسەرهاتی ئەو کچە چاوهەنگوینییەی ڕاکێشابوو، کەڵکی ئەوەی نەمابوو ئومێدت بە دۆزینەوەی ڕاستیی بەسەرهاتەکە هەبێت، کە بە ڕێککەوت لە عەسرێکی فێنکی نیساندا، لەو کاتەی کیلۆیەك تەماتەی لە دوکانەکەی ئێمەدا دەکڕی بێ ئەوەی قسە بۆ من بکات، ڕاستییەکەم لە دەمی خۆی بیست..

ئەم کچە چاوهەنگوینییە پێش پانزە ساڵ لەو عەسرە فێنکە و لە یەکێك لە گوندەکانی کەندێناوەدا، ماوەی هەفتەیەك لە ماڵەوە دەڕوات و ون دەبێت، لە هەموو گوندەکانی کەندێناوە و قەراج و شەمامکدا بە شوێنیدا دەگەڕێن و نایدۆزنەوە..

سبەینەی هەشتەم، بەپێی خۆی هاتەوە ماڵەوە، خێزان و

دراوسێ و ئەو خزمانەی لە دەوریدا کۆبوونەوە کە پێشتر خەیاڵیان بۆ ڕفاندن و کوشتن و شتی خراپتریش چووبوو، لە بریسکانەوەی چاو و گەشانەوەی ڕوومەت و دەرپەڕینی وردەدەمارە سەوزەکانی لاجانگ و لامل و گەردنییەوە تووشی سەرسوڕمان ببوون، هەموو جەستەی پێدەکەنی، ئەو تاجەگوڵینەیەی وەکو شازادەیەکی ناو هەقایەتە کۆنەکان لەسەری کردبوو، هاوئاهەنگ بوو لەگەڵ ئەو خوێنە تازەیەی لە لێوەکانی زابوون، وەك خوێنی ئەو بەرخە بەستەزمانەی لەبەردەم ماڵەکەیاندا لە خۆشیی هاتنەوەی سەریان بڕی..

لە وەڵامی هەر کەسێکیش بیپرسیایە ئەو هەفتەیە لە کوێ بووە؟ ئەو کچە یەك تاکە وەڵامی هەبوو: لە بە هەشت..

سەرەتا لەبەر گۆرانی و هەڵپەڕین و هەلهەلە و تەقەی خۆشی کەس بەوردی لەسەر وەڵامەکەی نەوەستا، تا ئەوەی مەلای گوند وتارێکی پێشکەش کرد و لەبەر حورمەتی مامۆستا بێدەنگ بووین، کەچی لە وەڵامی مەلاکەشدا کە پرسی کچم دڵخۆشین بە سەلامەتیت، خۆ کەس ئەزیەتی نەداویت؟ لە کوێ بوویت دایکەکەم؟

بە خەندەیەك کە لەو پرسیارە ناخۆشە نەدەوەشایەوە، گوتی: لە بەهەشت بووم!

ئەم هەواڵە تەقیەوە، تەقینەوەیەك زۆر بەرزتر لە دەنگی ئەو تۆپە نەمساویانەی زوو زوو ڕژێمی بەعس لە گرد و بەرزاییەکانی کەندێناوەی دەگرت کە پێشمەرگە دلێر و سکبەتاڵەکان خۆیان تێدا حەشار دەدا، پێویست ناکا باسی ئەوە بکەم لە سەرەتادا باوك و برا چەندیان لێ دا و خوشك و براژنەکانی لەسەر ئەو وەڵامەی چەند تۆپەڵە قژیان دەرهێنا..

کێشەکە لەوەدابوو هەموو ئەو قسانەی لەبارەی بەهەشتەوە دەیکرد ڕاست بوون، هەمووومان دەمانزانی بە زەحمەت ناوی خۆی پێ دەنووسرێ، کەچی بەقەد دوو مەلا و چوار قەشە لەبارەی بەهەشتەوە زانیاری هەبوو، کە چۆن بەرگی ئیستەبرەقی پۆشیوە و لە خۆشییاندا پەشۆکاوە و دەمی وشك بووە، یەکدوو قوم ئاوی کەوسەریان لە دەفرێکی زێڕ داوەتێ کە لە هەنگوین شیرینتر و لە بەفر سپیتر بووە، لە سێبەری درەختی "تووبا" بە ئاوی ڕووباری "تەسنیم" دەموچاوی شۆردووە کە لە شیلەی خاڵسی مەختووم دروست کراوە..

خۆ نە زمانی ئیتاڵی دەزانی و نە خوێندەوارییەکەشی بەشی ئەوەی دەکرد "فیردەوس"ی "ئەلیجێری دانتی" بە زمانێکی تر خوێندبێتەوە، ئەی چۆن قسەکانی بە نوقتە و فاریزە لەگەڵ بەشی فیردەوسی کتێبی کۆمیدیای خواوەندی ئەلیجێری دانتی یەکیان دەگرتەوە؟

هەمان گەشتەکەی دانتی بوو بەرەو بەهەشت:

- ڕۆژی یەکەم هەورەکانی تێپەڕاند و گەیشتە ئاسمانی یەکەم، ئاسمانی مانگ، پێی گوتراوە کە ئەو پەلانەی لەسەر مانگدا دەبینرێن ڕاستییەکەی ئەو دارە کەڵەکەبووانەیە کە قابیل بۆ هەتاهەتایە دەبوو بۆ سووتاندنی خۆی لە جەهەننەمدا کۆیان بکاتەوە، چونکە چیرۆکی دەستپێکردنی دنیای بە کوشتن دەست پێ کرد و لە سەرەتاوە خەڵکی ئەم جیهانەی لە خۆشویستن سارد کردەوە.

- ئاسمانی دووەم بە ڕۆحە باشەکان ڕازاوە بوو، دەبریسکانەوە تاوەکوو شەڕەف و شکۆ نەمر بن.

- لە ئاسمانی سێیەمدا کە ئاسمانی هەسارەی زوهرەیە، ڕۆحەکان پەیوەستن بە خۆشەویستییەوە، چونکە لە کۆنیشدا ئەو هەسارەیە پەیوەندی هەبووە بە ڤینۆسی خواوەندی جوانی و خۆشەویستی.

- لەئاسمانی چوارەمدا پیرەمێردێکی نێوچەوان نوورانی دیوە بە زەحمەت ناوەکەی بیر مابوو: تۆماس ئەکوینی، هەندێ حیکمەت و ئامۆژگاری پێ داوە لەبارەی ئەوەی چۆن بگەڕێتەوە کەندێناوە، چونکە کەس شوێنی کوردەکان نازانێت تەنها ئەوانە نەبن کە دەچنە دەرەوەی ئەم هەسارەیە.

- لە ئاسمانی پێنجەمدا ئەو ڕۆحانە دەبینرێن لەپێناو بڕواکانیان جەنگاون.

- لە ئاسمانی شەشەمدا شتێکیان لەسەر دەستی کچەکە کوتابوو: Diligite Iustitiam

سەرەتا زەندەقمان چوو، ئەمە جنێوێك نەبێت بە خۆمان و بابوباپیرمان درابێت، لەسەر ئەمە ئەمجارە ئێمە تۆپەڵێکی تر قژیمان دەرهێنا، تا ماڵی قەشەیەك لە عەنکاوە ئاوا بێت تێی گەیاندین ئەمە بە لاتینی واتا: دادپەروەریتان خۆش بوێ.

- لە ئاسمانی حەوتەمدا ئەو ڕۆحانە هەن کە لە بووندا ڕادەمێنن، بە قسەی ئەو کچە هیچ فانییەك ناتوانێت باسی ئەو چێژە بکات کە لەو تەبەقەیەدا هەیە، هەستێکە لە مۆسیقا خۆشتر و لە هەنگوین شیرینتر.

لەمەش زیاتر، مامۆستا پرچ و ڕدێن زۆرەکەی فیزیا لە دواناوەندیی دیبەگە، خەریك بوو ئەو هەسارەی زەوییەی لەسەر مێزەکەی بەڕێوبەر دانرابوو لەسەری خۆیدا بشکێنێ، کە بیستی ئەو کچە بە شێوەزارە دەشتەکییەکەی خۆی، باس لە هەمان تیۆری فرەگەردوونیی ئەنیشتاین دەکا، کە چۆن بۆ گەیشتنە بەهەشت لەکونێکی ڕەشەوە پەڕیوەتەوە بۆ گەردوونێکی تر..

بەپێی قسەکانی کچەکە، لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا تەنها هەندێك گیای وشککراوەی تاڵیشکەی خواردووە کە لە کیسە تووتنە شۆڕاوەکەی باوکیدا هەڵیگرتووە، ئێمە ئەو گیایەمان بینیبوو، گەڵایەکی زبری هەیە و خواردنی کەوەکانە، کە پرسیمان، مامۆستای زیندەوەرزانیمان زانیارییەکەی پشتڕاست کردەوە کە نەك گەڵایەکی بەسوودە و مرۆڤ دەژیێنێت، بەڵکوو ڕەشیقیشی دەکات.

مامۆستا جەلیلی بیرکاری لە ناوەندیی ئیبن خەلەکان سوێندی دەخوارد شەو نەخەوتووە و بە قەڵەم و دەفتەر حسێبی کردووە، ئەگەر ئەو کچە بەخێرایی تیشك کە دەکاتە سێسەد هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، بۆ ماوەی هەفتەیەك ڕۆیشتبێت، ئەوا بە ئاسانی دەچێتە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر و ڕێگای کاکێشان و دەشگەڕێتەوە، تەنانەت بەو دڵنیاییەی کە کارمەندەکانی دەرمانخانەکانی پێ دەناسرێتەوە، دەیگوت: مەجال هەیە لەیەکدوو تەبەقەی ئاسمانیشدا ئیسراحەتێك بکا.

ئەوەی سەری لە هەمووان شێواندبوو قسەکان نەبوون، زیاتر ئەو تاجە گوڵینەیەی سەری بوو کە بە گەڵای غار دروست کرابوو، ئەو گەڵایە خزمایەتیشی نەبوو لەگەڵ ئەو کەنگر و توڵەکە و پیفۆك و کوارگ و دۆمبەلانانەی ڕۆژانە لەو مانگی نیسانە مێژووییەدا

هەموومانی لە دۆڵ و بەرزاییەکانی زوورگەزراودا، هەر یەکە و بە قەڵەمبڕ و تەبشوویێکەوە کۆ دەکردەوە..

ئەم بەسەرهاتە پاکە تا ئەو ئێوارەیە بەئاڵۆزی مایەوە، کە من لە پشتەوەی سندووقە ڕیزکراوەکانی دوکانەکەمان تووری قوڕاویم لەناو تەشتێکی شینی پڕ ئاودا دەشووشتەوە، کچەیش بێ ئەوەی بمبینێ، بەدەم هەڵبژاردنی کیلۆیەك تەماتەوە ڕاستیی بەسەرهاتەکەی بۆ دایکم گێڕایەوە..

ئەوجا زانیم ئەوەی لەگەڵ ئەو کەسە بێت کە خۆشی دەوێ، ڕێك لە بەهەشتدایە: داستانەکان، ئیمانەکان، بیردۆزەکان، تەنها لێکدانەوەی هەمەجۆرن بۆ گەشتی خۆشەویستی..

دەرچوو ئەو چاوهەنگوینییە هەفتەیەك لەگەڵ کوڕێکدا ڕۆیشتووە کە یەکتریان خۆشویستووە.

لە درزەکانی سندووقە سێوە نیوەبەتاڵەکە، بە چاوی پڕەوە سەیرێکم کرد، منداڵە ساواکەی لە باوەش کردبوو، منداڵێکی چوار ساڵیشی لەتەنیشت وەستابوو کە جارجارە دەنکە خورمایەکی دەخوارد، دایکم پێی گوت: پێم خۆشە هاتیەوە.

بە دەنگی ئەو ژنانەی بۆ گەرمبوونەوە هاوسەرگیری دەکەن و کەچی دەسووتێن، گوتی: بریا لەو هەفتەیە، لە بەهەشتی باوەشی

ئەو کوڕە مردبام، نەك ئێستا تەماتەی تورت هەڵبژێرم بۆ چێشتی پیاوێك، کە خۆشم ناوێ..!

# وا دەڕوا و بەجێم دێڵێ

وەك ئەلبوومی فڕێدراوی ناو کەنتۆرێك

وەکو ئەلقەی بەجێماوی سەر دەستشۆرێك

وەکو گوڵێکی ژاکاوی ناو مافوورێك

وەك کلیلی ژێر ئینجانەی حەوشەکەتان بەجێت هێشتم..

بەشی مەرگی ئازیزانیش تۆ فرمێسکت پێ نەهێشتم

لە لای زۆر کەس پەیوەندییەکان یاری و گەمەن

بەلام لای من

خۆشەویستیت تەمەنێك بوو، لەناو تەمەن.

# جەرد

هەموو فەرمانگەیەك، تەنانەت خاوەنی دوکانێکیش لە کۆتایی ساڵدا جەردێك دەکا، جەردێك بە قازانج و زیانەکانی، منیش لە کۆتایی ئەم تەمەنە کورتەی لەسەر ئەو هەسارەیە هەمبووە وردەوردە خەریکی جەردم..

ئەگەر وەکوو ئەحمەد هەردی، منیش لەسەر لووتکەی ژیاندا بوەستم و شریتی عومری ڕابردووم بێنمە بەرچاوم، سەدان دیمەنی کورت کورت دێن و دەڕۆن، دیمەن هەیە شایەنی ئەوەیە خێرای بکەم و یەکدوو چرکەی لێ بمێنێتەوە، دیمەن هەیە خۆی یەکدوو چرکەیە و بەزۆر درێژی دەکەمەوە..

مرۆڤ لە کۆتاییدا دەبێتە چەند فۆتۆیەك و چەند گرتەیەکی ڤیدیۆیی، ئەویش تەنها لە یادەوەریی ئەو کەسانەی کە ناسیویانە، دەنا ڕۆژانە خەڵك لە شوێنی دیکە و بە زمانی دیکە دەمرن و لە میمۆریی ئێمەدا فۆتۆ و ڤیدیۆیان نییە، نیعمەتێکی گەورەیە کە شەریحەی یادەوەریی مرۆڤ شوێنی زۆر گرتە ناگرێ و هەمیشە ڤیدیۆی نوێ شوێنی ڤیدیۆی کۆن دەگرێتەوە، ئەمەیە دەڵێن لەبیرچوونەوە نیعمەتێکی گەورەیە، گرتەی لە دایکبوونی منداڵێکت شوێن بە گرتەی مردنی باپیرەت یان خزمێکت چۆڵ دەکات، تا لە

کۆتاییدا هەمووومان دەمرین و لە میمۆری دوو نەوەی پاش خۆمان نامێنین، هەر وەك بەرگریکردنێك بەرامبەر ئەو لەبیرچوونەوەیە هەموو بوونەوەرەکان بەرگری لە مانەوەی جیناتی خۆیان دەکەن لە ڕێگەی زاوزێ و پاراستنی نەژادەوە.

یەکێك لە سوودەکانی زمان و نووسین، تۆمارکردنی ئەو گرتانەیە، لەوانەیە لەبەر ئەمەش بێت هەمووومان حەز دەکەین حیکایەتی خۆمان بگێڕینەوە، کە مرۆڤێکی سەرەتایی لەسەر دیواری ئەشکەوتێك وێنەی ورچێکی دەکێشا، دەیویست گرتەی خۆیمان بۆ بگێڕێتەوە، هەوڵی دۆزینەوەی زمان هەوڵی مانەوەی گرتەکانی یادەوەریی مرۆڤە، وێنەکانی زمانەکانی بزماری هیرۆغلیفی و سەنسکریتی بەرگریکردنە لە فەوتانی ئەو فۆتۆ و ڤیدیۆیانە..

ئەو دیمەنانە بە ڕوونی ئاڵۆزییان تێدایە و

بە ئاڵۆزییش ڕوونییان تێدا دەبینی.

کێشە گەورەکە لەوەدایە ئەو فۆتۆ و ڤیدیۆیانە لەوەتەی مرۆڤ هەیە دووبارە دەبنەوە، کەچی هەر یەکێك لە ئێمە پێی وایە ئەو فۆتۆ و ڤیدیۆیانەی تۆماری کردوون، تەنها ئەو بینیویەتی!

لە وەتەی مرۆڤ هەیە دایکی دەمرێت، منداڵی دەبێت، پیر دەبێت، خۆشەویستی و ڕق ئەزموون دەکا، کەچی ناتوانێت و ناتوانێت تێبگا کە بە لەناوچوونی ئەو فۆتۆ و ڤیدیۆیانەی ئەو، فۆتۆ و ڤیدیۆی دیکە پەیدا دەبن، لێرەوە گرنگیی خوێندنەوە دەست پێ دەکا، جار هەبووە کەسێکم دیوە باسی هەستێکی بۆ کردووم کە

پێی وابووە کەس هەستی پێ نەکردووە، من پێشتر ئەو هەستەم لای نووسەرێك بینیوە کە زیاتر لە هەزار ساڵ پێش ئێستا نووسیویەتی! سەراپای ئەو گرتانەی پێمان وایە تەنها لە میمۆری ئێمەدایە سەبارەت بە عەشق و جوانی و سروشت و نەمرییەوە، پەنجا کتێب بەسە بیانخوێنیتەوە و بزانیت چەند جوانتر باس کراون، ئەلیازەی هۆمیرۆس و هونەری خۆشەویستیی ئۆڤید و کۆمیدیای خواوەندی دانتی و تەوقی کۆتری ئیبن حەزمی ئەندەلووسی و ڕاپۆرت بۆ گریکۆی کازانتزاکیس و ڕۆمانەکانی کامۆ و هتد..

بەڵی ڕاستە فۆتۆ و ڤیدیۆکانی یادەوەریمان ئازیزن، جیاوازن.. بەڵام بێهاوتا نین.

میمۆریم وەکوو هەموو شتێکی ئەم دنیایە سەرەتاکەی باشە و کۆتاییەکەی نەهامەتییە، هەر ڕێك دەڵێی پێکەنینی داپیرەمە، سەرەتا پێکەنین بوو و لە کۆتاییدا دەبووە کۆکە.

لەپشت هەر دیمەنێکی ناو یادەوەریمان جۆرە مۆسیقایەکی تەسویریی دەڕوات، دیکۆر و ڕووناکی جیاواز هەن..

بۆ نموونە: لەپشت هەموو ئەو گرتە ڤیدیۆ سیاسی و نەتەوەییانەی لە میمۆری مندایە، مۆسیقا تەسویرییەکەی زوڕنایەك هەیە.

لەپشت دیمەنەکانی مەکتەب و کۆڵان و بازاڕ و شار و خەڵك، دەنگی شمشاڵێکی غەمگین هەیە.

لەپشت دیمەنی پیرەمێردێك لە شێخەڵا کە عەرەبانەکەی لە تاسەیەکدا دەپەڕێنێتەوە، دەنگێك دەڵێ: یا ئەڵڵا.

لەپشت دیمەن و گرتە ڤیدیۆییە کورتەکانیشم لەگەڵ تۆ،

چەلۆیەك هەیە.. چەلۆیەك لەسەر مەقامی بەیات.

## تیۆر

ڕەوایە من بتنووسمەوە و ڕۆژێك بێت، دنیا لە دەفتەرەکانی خۆیت بسڕێتەوە؟!

بە لای دڵەوە، لەسەر سینگمدا پەڵەی دووریت ڕێك دەڵێی پەڵەی سمی ئەو ئەسپەیە بەسەر سینگی حوسێنەوە.

لە قوڕگمدا ناوت هەناسەی گرتووم، ڕێك وەك ئەو پەتەی لە قوڕگی حەلاجەوە گیر بوو.

ئامادە بووم هەردوو دەستی خۆمت پێشکەش بکەم، نەوەك کەس پەنجەت بۆ درێژ بکا.

هەر کاتەی تۆ سەفەرێك دەکەیت، وەکوو لقی ئەو درەختەی چۆلەکەیەکی لەسەر دەفڕێت، دەلەرێمەوە.

هەر کاتەی دەگەڕێیتەوە خۆم بە قەرزاری ئەو تۆپانە دەزانم کە وەك هەسارەی زەوی لەسەر مێزی بەڕێوبەری قوتابخانەکانە.

ئەی ئەو کەسەی ئەم هەسارەیەت بۆ کردمە ئەو تۆپەی بە منداڵی لەگەڵ خۆمدا دەمخەواند:

ڕەوا نییە

ئەم گەردوونە بە تەقینەوەی مەزن دەست پێ بکا و

بە بێدەنگبوونی تۆ کۆتایی بێت!

# ڕەسم

پێ دەچێت

فریشتەی مردن ئەلبوومێکی گەورە گەورەی پڕ لە وێنەی ئێمەی لە لابێ

هەر ڕۆحێك بکێشێت

وێنەی خۆشەویستەکەی نیشان بدات

بۆیە هەمووان

پێش گیانسپاردن

بەنەرمی چاو دادەخەین و

هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشین.

# سبەینەی تاریک

ویستم تەنها دێڕێکی شاعیرێکی ئینگلیز بنووسم کە ناوی کیتسە، ڕابەری شێوازی ڕۆمانتیکییە و لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا بە نەخۆشیی سیل مردووە، ئەو دێڕەی ئەو لەگەڵ چارەنووسی پەیوەندییە مرۆییەکان یەك دەگرێتەوە:

(من ترسنۆکم، توانام نییە بەرگەی ئەو ئازارە بگرم کە ناوی بەختەوەرییە).

بەردەوام بەو شاعیرە ژنێکی بە تەمەنی بازاڕی کورانم بیر دەکەوێتەوە..

دایە نەخشین، سبەینان زوو لەنزیك دوکانەکەمان دوو گونیەی بەیەکەوە دووراوی ڕادەخست و تەڕەپیاز و سلق و تووری دەفرۆشت، چەقۆیەکی پڕ بوو کە هەمیشە تیژی دەکردەوە، بڕوا ناکەم ڕۆژێك دوو دیناری قازانج کردبێت، چونکە لاسکی توور و لاسکی تەڕەپیاز و سلقی هێندە لێ دەکردەوە، گەر بتکێشایە چارەگێکیان مابوویەوە، وەکو ئەوەی لە ڕێگەی لەتوپەتکردنی سەوزەکانەوە تۆڵەی خۆی لەو هەتیوە نەناسراوە بکاتەوە کە

سبەینەك لەو سبەینانەی بۆ فڕین نەدەشیا، لەسەر جووتێك کۆتری ئەجەفی کوڕەکەی بە چەقۆ کوشتبوو..

دایە ئەخشین لەبەرخۆیەوە سەردوولکەی بۆ خالیدی کوڕی دەهۆنییەوە و منیش لەتەنیشتی دادەنیشتم و گوێم دەگرت، بە قافیەی جوان و داڕشتنی خوساو لەناو فرمێسکەوە لۆکەی کۆ دەکردەوە، لۆکەی لە بالیفی بچووکی ساوایانی ناو بێشکە دەهێنا، لۆکەی لە گوێی پیرەمێردانی لە ماڵ دەرکراوی بەردەم مزگەوتەکان دەهێنا کە لە دەوری تەختەی دامەوە کۆ دەبوونەوە و لەبەر گوێگرانییان کەس قسەی ئەوی دیکەی نەدەبیست و هەمووان لە یەك کاتدا گلەییان لەیەکتر دەکرد، لۆکەی لەناو دۆشەکی شەوی یەکەمی بووك و زاواکان دەهێنا، لەناو ئەو لێفانەی دەهێنا کە ئاوارەکانی قوشتەپە بە منداڵەکانیان دادابوو، لۆکەی لەناو قەمسەلە شینە لەماعەکەی دایکەمەوە دەهێنا..

دواتر لە نووزانەوەکەیدا، ئاوی کۆ دەکردەوە، ئاو لە کووپەی هەیوانی ماڵێك لە ئاوایی شێرکاوە کە دواتر زانیمان گوندێکی نزیك چۆمانە و ماڵی باپیرەی خۆی بووە، ئاوی لە چاوی بریسکاوەی ئەو ژنانە دەهێنا کە یەکەم منداڵیان لەدایك بووە، فرمێسکی لە تەعزیەکان و جیابوونەوەی عاشقەکان کۆ دەکردوە، فرمێسکی شەرمنانەی مێردەکەی لەو سبەینە شوومەدا..

لە کۆتایی لاواندنەوەکەیدا، لۆکەکانی دەخستە ناو ئاوەکان و بەهێواشی یەکە یەکە شوێن چەقۆکانی سەر سینگ و لاملی خالیدی پێ تەڕ دەکرد.

# کابالا

**کتێبێکم لەبارەی کابالاوە خوێندەوە..**

کابالا بزاوتێکی فەلسەفییە لە هەناوی ئایینی یەهودییەوە لەدایك بووە، بڕوا و تێڕامانێکی ڕۆحیانییە و ژیان و مردن و پەیوەندیی نێوان خودای سەرمەدی و گەردوونی کاتی لێك دەداتەوە، چەندین سەدە تەنها لای یەهوودییەکان بوو، دواتر لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە کەوتە خۆرئاواوە و ئەوانیش کابالای مەسیحییان داهێنا، بە بڕوای ئەو دنیابینییە ناوەکییە ئایینییەی ئەوان: خودا سەرەتا ڕۆحەکان دروست دەکا، دواتریش جەستەکان..

فەرمان بە هەر ڕۆحێك دەکا بچێتە ناو ئەو جەستەیەی بۆی دەردەچێت، هەموو ڕۆحەکان دەپاڕێنەوە کە پاکن و نەیانخەنە ناو ئەو جەستەیەی مەحکوومە بە نەخۆشی و پیربوون و مردن..

ڕۆحی خۆم لەبەر چاوە: ئەو کاتەی فەرمانی پێ کراوە بچێتە ناو ئەم جەستەیەی ئێستامەوە، پاڕاوەتەوە نەچێت، پێی لەعەرز چەقاندووە ئەو کاتەی دوو فریشتە ڕایاندەکێشا ببڕێتە لەشمەوە..

نەك لەبەر نەخۆشی و پیربوون و مردن

نا

ئەو ڕۆحە دەیزانی لە کۆتاییدا لەو شارە نامرێت کە تۆی تێدا دەژیت..

# نێرڤانا

ئەم ماوەیە سیوران دەخوێنمەوە..

ئیمیل سیوران شاعیر و فەیلەسووفێکی ڕۆمانییە و بە هەردوو زمانی فەرەنسی و ڕۆمانی دەنووسێت، بە باوکی تێکستی ڕەشبین دەناسرێت، مامۆستای بێهوودەییە، زۆری لەبارەی خۆکوشتنەوە نووسیوە، لەبارەی شەونخوونی و دژایەتیکردنی ژیان، ڕێك دەڵێی ڕۆکانتانی پاڵەوانی ڕۆمانی "هێڵنج"ی جان پۆل سارتەرە کە هیچ بڕیارێکی بۆ نادرێت، چونکە هەست دەکات زیندووەکان قەت خاوەنی هیچ بەهرەیەك نەبوون..

ئەم دنیابینییە ڕەشبینییە دەیەوێت بڕواتە سەرووی ئازارەوە، بۆیە بەردەوام سەرسامی فەلسەفەی بوودایی و هیندۆسییەکانە، لەوەی بە بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ سەرووی ئازار دەگاتە ئارامی و حاڵەتێکی وجوودیی باڵا کە پێی دەڵێن نێرڤانا..

سیوران بەختەوەری لە ژیاندا نابینێت، بەڵکوو لەوەدا کە مرۆڤ لەدایك نەبێت، چاوی سیوران وەك ئەشیعەی سینگ ئەودیوی هەستەکانی مرۆڤ دەبینێت، هەرچی قسە و بەرگ و گۆشتە لەو وێنەیە دەرناکەوێت کە بۆ مرۆڤی دەکێشێت، تەنها پەیکەری

ئێلسقانی مرۆڤ دەبینێت کە چۆن وردە وردە لە تەمەنێکی کورتدا ناسك و ناسکتر دەبێتەوە و هەڵدەوەرێت..

سیوران پێی وایە خۆشەویستی تەنها بۆ ئەوەیە هەستی تەنیابوون و بێکەسی لای مرۆڤەکان کەم بکاتەوە، عاشقەکان بەو ئەسپانە دەچوێنێت کە دەچنە تەنیشت یەکتر و بەکۆمەڵ جووتە بەرامبەر هێرشی گورگەکان داوێن، هەموو هۆنراوە و گۆرانی و نامەکان بەرگریکردنە بەرامبەر بێکەسی و ئەو ساتەی لە گیانەڵادا مرۆڤ بەرامبەر چارەنووسی تەنیابوونی خۆی دەوەستێتەوە.

دانپێدانان و نەفرەتەکان، ئەو کتێبەیە کە زیندووەکان لە وەهمی زیرەکی بەتاڵ دەکاتەوە، کتێبی قوربانییەکی مێژووە کە ڕازی نییە کەس دڵی بداتەوە و سکی پێ بسووتێ.

ئامادە نییە بە فێڵی ئامۆژگاری لەگەڵ گەردوون ئاشتبێتەوە..

بوەستە با هەندێك لە بۆچوونەکانی ئەوت بۆ وەربگێڕم:

- لە فەرهەنگمدا وشە لە دوای وشەم سڕیەوە، لەو کوشتارگەیەی ئەنجامم دا یەك وشە دەربازی بوو: تەنیایی..

- با بۆ کاتێکی دیاریکراویش بێت پاشەکشە بکەین بۆ ناخی خۆمان، وەك چۆن خودا کردی دوای شەشەمین ڕۆژی دنیادروستکردن، لانی کەم با لەمەدا لاسایی بکەینەوە.

- هەموو وەرزێك مەینەتییە، سروشت دەگۆڕێ و نوێ دەبێتەوە بەس بۆ لێدانی ئێمە.

- بۆچوون؟ بەڵێ بڕوابوون؟ نەخێر: ئەمە خاڵی دەستپێکردنە بەرەو شانازیی عەقڵ.

- نایابترین شت ئەوەیە: هەموو ڕۆژێکی تازە، هۆکارێکی نوێمان پێ دەبەخشێت بۆ هەڵوەرین.

- دوای ساڵانێکی زۆر بینیمەوە، لەپاش تەمەنێکی تەواو، پرسیم: بۆچی دەگری؟

گوتی: من ناگریم..

لە ڕاستیشدا نەدەگریا، بەڵکو بە ڕوومدا پێدەکەنی، بەڵام تەمەن هێندە ڕووخساری شێواندبوو شادومانی لەناو پێچی لۆچی ڕووخساریدا ڕێگەی نەبوو سەر دەربێنێ، لەوکاتەدا ئێمە دەمانتوانی شتێکی تریش لە ڕووخساریدا بخوێنینەوە: ئەوەی بە گەنجی نەمرێت، زوو بێت یان درەنگ پەشیمان دەبێتەوە.

- پێویستە هاوڕێکانمان بێزار نەکەین تەنیا لە کاتی ناشتنمان نەبێت، هەرچەندە بۆ ئەمەش کەمێك گومانم هەیە.

- تۆلیۆس شیشرۆن، نووسەر و وتاربێژی ڕۆمانی کە سەدەیەك پێش زایین ژیاوە، لە گوندەکەی خۆیاندا دوای مردنی تۆلیای کچی لە ماڵ نەدەهاتە دەرەوە و بووە نێچیری خەفەت، تەنها خەریکی ئەوەبوو نامەی پرسەی دەنووسی و بۆ خۆی دەنارد، چەند مایەی داخە ئەو نامانە فەوتان، زیاتر لەوەش مایەی داخە ئەو شێوازە نەبووە شێوازێکی باوی دڵدانەوەی خۆمان، خۆ ئەگەر ئەو شێوازەمان هەڵبژاردبا ئەوا ئایینەکان زۆر لەمێژبوو مایەپووچیی خۆیان ڕاگەیاندبوو.

- بۆ ئەوەی تێبگەین مرۆڤایەتی گەیشتۆتە چ ئاستێکی دارمان، هیچ لەو بەڵگەیە باشتر نییە کە لە ئێستادا ناتوانین یەك تاکە میللەت بدۆزینەوە، یان تەنانەت هۆزێك، تیایدا لەدایکبوونی منداڵێك ببێتە مایەی پرسەدانان و نووزانەوە.

- کارتی براوە و یەکلاکەرەوەی ئەوانەی لە گیانەڵادان ئەوەیە: دەتوانن بە دڵی خۆیان هەموو ئەو شتە پووچانە بڵێن کە بە خەیاڵیاندا دێت، بێ ئەوەی بترسن لەوەی لەسەر ناو و ناوبانگیان بکەوێت

- باشترین رێگە بۆ دەربازبوون لە دوژمنت ئەوەیە: لە هەموو شوێنێك ستایشی بکەیت، ئەمەی بۆ دەگێڕنەوە و تواناى خراپەکردنی بەرامبەر تۆ نامێنێ، بەم شێوەیە حەزی سەرەکیت لەناوبرد، بەردەوام دەبێت لە هێرشکردنە سەر تۆ، بەڵام بەبێ پاڵنەر و سووربوون، چونکە لە بێئاگاییدا دەستی لە رقلێبوونەوەی تۆ هەڵگرتووە، ئەو دۆڕاوە کە ئاگای لە دۆڕاندنی خۆی نییە.

- سروشت بۆ شێوازێك گەڕا تا هەمووان رازی بکات، بۆ ئەمەش مردنی هەڵبژارد..

کەچی کەس بە مردن رازی نییە..

- هەر کرمێك هەست بکات یەکەمین کرمە لەناو کرمەکان، یەکسەر دێتە پلەی مرۆڤەوە.

- قسەکردن، کەموکورتیی دەرمانەکان دادەپۆشێ و زۆربەی نەخۆشییەکان چارە دەکا، بۆیە زۆربڵێکان سەردانی دەرمانخانەکان ناکەن.

- ئای ئەگەر دەمانتوانی هەموو ئەو کەسانە لەناو ببەین کە تەنها دەزانن لەسەر سەکۆکاندا هەناسە بدەن.

- دەبێ بێئاگا بین لەوەی دەگوزەرێت، بێئاگایی فریشتەیەك یان گەمژەیەك، تاوەکوو پێمان وا بێت کە ڕەنگە گەشتی مرۆڤایەتی بەسەلامەتی بگاتە جێ.

- ئەگەر زەمەن میراتی و خاوەندارێتی بووایە، ئەوا مردن خراپترین شێوازەکانی تالانی و ڕووتکردنەوە بوو.

- خۆشترین شت لە خۆشەویستیدا، کە تاکە خۆشییە، ئەوەیە وا دەکات بەختەوەری لە ئازار جیا نەکرێتەوە.

سیوران لە کۆتایی ژیانیدا تووشی نەخۆشیی زەهایمەر بوو، بە ئازارەوە گەیشتە خۆزگە ئەزەلییەکەی لەبیرچوونەوەوە، گەیشتە سەرووی ماددەوە کە بەردەوام خەونی پێوە دەبینی، ئومێدی بوو مرۆڤەکان بگەنە ئەو بڕوایەی کە بەردیش بۆی هەیە شەرم لە ڕەقیی خۆی نەکات و وەك سەرینێك ڕێزی بگیرێت و ناز بکا.

تەنەکەیەکی خۆڵیش مافی خۆیەتی وەك موحەجەرەی هەیوانێك یەك دوو ئینجانەی گوڵەهێرۆی پێوە هەڵواسرێت.

چوونە سەرووی نەهامەتی و جەرگسووتان، ئەو ژنە بەستەزمانەم دێنێتەوە یاد کە شەرواڵی پیاوانی لەبەر دەکرد و لە بازاڕی کوراندا سەرەتا خەڵك لێی تووڕە دەبوون، زۆر لێی تووڕە دەبوون، چونکە سندووقی ترێی دەگرت و ڕایدەوەشاند، سەبەتەی

پڕ چەرەزاتی دوکانەکەی مام یەحیا مەسیفی دەسکاری دەرکرد، کارتۆنی پڕ تەبەقە هێلکەکانی دەهێنا و دەبرد، عەرەبانەی سەر پڕ شووشە و پیاڵە و پەرداخی دەلەراندەوە، ئای لە ماتبوونی خەڵکی ئەو بازاڕە، وای لە پەشیمانیی دوکاندارەکان کە زانییان ئەو ژنە دوای ئەوەی مێردەکەی منداڵەکانی لێ سەندووە، شێت بووە و هەموو شتێك دێنێ و دەبات بەس کەمێك لە لانك بچێت!

# کەوتنی مانگ

تەماشای یەکتر دەکەین..

تەنها تەماشای یەکتر دەکەین، سەرقاڵی چاودێریین لە جیهان و خەڵك، لە خانووەکان، لە نرخەکان، لە ئۆتۆمبێلەکان و جلوبەرگەکان، لە مۆدێلە تازەکان، لە لووت و دەم و گوێی ئەوانی تر، لە دیسکاونتەکانی مۆڵەکان و لۆگۆی عیادەکانی جوانکاری..

تەماشای جیهانی سەرمایەداری دەکەین، خەریکی پەیوەندیی هاکەزایین: ناسین و هاوڕێیەتی سەرپێیی و کورتخایەن.

سلاڤۆی ژیژك ڕاست دەکا کە لەم سەردەمەدا زەندەقمان لە پەیوەندیی قووڵ چووە، کەمینەن ئەوانەی ئامادەن فرمێسك بۆ لەدەستدانی کەسێك بڕێژن، زۆربەمان ئەو قسە و پەندە هیچانە کۆ دەکەینەوە لەبارەی بڕوابەخۆبوون و بێمنەتییەوە دەگوترێن، تەنانەت کەمینەن ئەوانەی ئامادەن بە دیار نامەیەکی خواحافیزییەوە بۆ ماوەی نیو سەعات بێدەنگ بن..

فلتەرەکان جوانیان کردووین، ئەو میللەتەی سەدان ساڵە نەگەیشتە زمانێکی ستاندار، خەریکە دەگاتە ڕووخساری ستاندار!

لێرەدا بیرم نەچێت شتێك بڵێم: من بە مافی دەزانم مرۆڤەکان چی لە خۆیان دەکەن بیکەن مادام ئەزیەتی کەس نادەن، مافی خۆیانە لەو شەست حەفتا ساڵەی تیایدا دەژین چۆن ئەو گەشتە کەمەی ژیان بە ڕێ دەکەن، بەڵام بە ئەرکیشی دەزانم بڵێم: یەکێك لەو هۆکارانەی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەی گەیاندە ئەوەی گەر بە درۆش بێت جوان دەرکەون ئەوەیە پانتایی بوونبەخۆی نەماوە، مرۆڤەکان تەواو هەقیانە چیتر بە دروشمەکانی جوانکردنی وڵات و نیشتیمان هەڵنەخەڵەتێن و خەریکی پەنابردن بن بۆ جواننیشاندانی خۆیان، با لە ڕێگەی فەیکانەی فلتەرەکانیشەوە بێت..

ئەوەی وای کرد جیهان بەم بارودۆخە بگات تەنها سەرمایەداری نەبوو، لەوبەرەوە شۆڕشگێڕەکانیش بوون..

کێ بەقەد کیم ئیل سۆنگ بەڵێنی جوانکردنی مرۆڤەکان داوە؟! دە ببینە ئێستا گەلی کۆریای باکوور چۆن حەفتا ساڵە هەموو سبەینەیەك سەعات شەش بە کۆڵان و گەڕەك و شەقامەکان ناچارن گوێ لەو سرووده حەماسییە هیچە بگرن کە دەڵێت: ئازیزم ژەنراڵ لە کوێی؟!

کێ بەقەد ماوتسی تۆنگ لەبارەی یەکسانییەوە دواوە؟ دوای

ئەوەی گەلی چین یەك ملیۆن میل بە ناوی ئازادییەوە لەگەڵیدا ڕۆیشت، بە زنجیری دەبابە گۆشتی خوێندکارانی کردە قیمە.

کێ بەقەد فیدل کاسترۆ باسی دامەزراندنی فیردەوسی سەر زەوی کردووە؟! پێش ئەوەی کچەکەی خۆی بە چووپێکی ڕاوچییەکان بەرەو کەنارەکانی فلۆریدا ڕابکا و داوای پەناهەندەیی لەو دۆزەخە بکات کە باوکی وەسفی ئەمریکای پێ دەکرد.

کێ بەقەد حزبە کوردییەکان لە شاخ و دۆڵەکانەوە، لە مزگەتی گوندەکانەوە باسی لە نەهێشتنی نادادی و تالانی و گرتن و کوشتن کردووە؟!

دە ببینە چۆن تا بینەقاقایان نوقمی گەندەڵی بوون، هەر لە یاداشت و یادەوەرییەکانی خۆیان دەڵێن: نیوەی خەڵکمان فرۆشت و دەیانەوێ بە پارەکەی نیوەکەی تریش بکڕن!

سەیرەکە لەوەدایە هەموو شۆڕشگێڕەکان بۆ یەکجار بڕوایان بە شۆڕش هەیە تا بێنە دەسەڵات، کە هاتن ئیتر هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینێکی دیکە بە گێرەشێوێن ناو دەبەن، خومەینی بە هۆی کاسێتی تەسجیلەوە لە نزیك پاریس فەقیری دەخستە ئایەتێکەوە و باسی لە لەچاڵنانی سەردەمی دوور لە خوای دەکرد، کە گەیشتە دەسەڵات ئیتر بە دەمی حەفارە پەتی ملی ئازادیخوازەکانی بەرز دەکردەوە، قەزافی چل ساڵ مێشکی خەڵکی بەردایەوە بە شۆڕش و مەجدەوە دواتر بە خۆی و کوڕەکانی و بەکرێگیراوانی ئەفریقیاوە

قەتلوعامی هەمان میللەتی کرد کە ڕاپەڕی!

حیزبی کوردی لە شاخ شەو و ڕۆژ لەسەر پشتی کەرێکەوە داوای لە خەڵك دەکرد ڕاپەڕن، ڕێپێوان بکەن، کەچی کە گەیشتە دەسەڵات هەموو ڕێپێوان و ناڕەزایەتییەکی ڕەوای خەڵکی ستەمدیدەی هەمان میللەتی بە چەقۆ و شەقوەشێنەکانەوە قەدەغە کردا!

ئەو شۆڕشگێڕانەی پێش وەرگرتنی دەسەڵات دەیانگوت: کفن گیرفانی نییە، دوای وەرگرتنی دەسەڵات بوونە فیرعەون و دوو هێندەی ڕەمسیسی یەکەم پارە و ئاڵتوونیان کۆکردەوە، ئەوان بە ناوی جوانکردنی خاکەوە، نەك ماڵ و شار و وڵات، تەنانەت ڕووخساری خۆشمانیان لەبەر چاو ناشیرین کردین.

لێرەوە کۆڕەوی هەمووان دەست پێ دەکا: بەشێك هیجرەت لە شوێن دەکەن و بۆ دۆزینەوەی جوانییە لەدەستچووەکانیان، خۆیان و منداڵەکانیان بە ئاودا دەدەن و دەچنە هەندەران.

بەشێك هیجرەت لە زەمەن دەکەن و بۆ دۆزینەوەی ڕاستییە لەدستچووەکانیان، خۆیان بە کاتدا دەدەن و دەچنەوە ناو مێژوو، دەبنەوە قوتابی، هەیە قوتابیی قازی محەمەد و هەیشە قوتابیی ئیبن تەیمییە.

بەشێکیش هیجرەت لە واقیع دەکەن و بۆ لەبیرکردنی ناشیرینییەکانی ڕۆژگاریان تەنها دەرەقەتی دەسکاریکردنی لووت و

نینۆك و برژانگیان دێن..

چەند زەحمەتە ئەو ڕۆژگارەی تیایدا بەخێوکردنی پشیلەیەك بێ ئەزیەتتر بێت لە گرتنی یارێك.

چەند زەحمەتە بۆ ئەوەی بیسەلمێنیت کە هێشتا نەبوویتە گورگ، ببیتە کەسێکی نەباتی.

چەند زەحمەتە ئەوانەی ویستیان جوان بژین، ئیرەیی بەوانە ببەن کە باش دەژین.

ئەم سەردەمە پانتایی بە پاڵەوانبوونی لە هەموومان سەندەوە، بۆ ئاسوودەبوونی ویژدانیشمان هەندێ پەراوێزی بۆ جێ هێشتووین، بۆمان هەیە لە زەوی ڕامێنین و خەم لە پیسبوونی ژینگە و تووانەوەی بەستەڵەکەکانی باشوور و باکوور بخۆین، ڕۆژانە نیو سەعاتێك بە پێ بڕۆین و بە دیار هەواڵەکانەوە چاوەڕێی شەڕێکی گەورە بین، گرنگ ئەوەیە سەر هەڵنەبڕین، ئاگامان لە ئاسمان نەمێنێت..

دەیانەوێ وەك مێروولە سەرقاڵی بارکردنی ئەو توێکڵە گوڵەبەڕۆژەیە بین کە خۆیان ناوکەکەیان دزیوە.

دەیانەوێ بچینەوە ناو وردە لەزەتەکانی خۆمان و بە قووڵی بیر نەکەینەوە، بە قووڵی ڕەفتار نەکەین..!

بمانگەیەننە ئەو دۆخەی بەناچاری بڵێین: خۆشەویستی مرد و

## زیادە زیندوو

بێجگە لە دایك و باوك، هەمووان وزەت لێ دەبەن، لە هیچ بازنەیەکی ئەم ژیانە کەس پێت ناڵێ نرخت هەیە، نە لە خێزان و نە لە کۆڵان و نە لە شار و نە لە نەتەوە و نە لە جیهانیش، لەوانەیە هی ئەوەش بێت هەمووومان غەریبی منداڵیمان دەکەین، چونکە بەس لەوێدا وەکوو بێچووی ناو هێلانە سێ ژەمە دەممان دەکردەوە و باوکەکانمان لە دەرەوە، بێ ئەوەی هەست بکەین ئەو دەرەوەیە چەند غەدارە، پارووەنانێکیان دەهێنایەوە. نەك خەڵکەکان، خودی ئەم گەردوونەش بێبایەخی خۆتت نیشان دەدا، سەرەتا مەراقە دەروونییەکان و دواتر خەفەتە جەستەییەکانیشی دێتەسەر، چاوی کز و ددانی کەوتوو و پەنکریاسێك کە بە نیوەی تاقەتی کار دەکا.

مرۆڤەکان زیاد لە پێویست هەست بە زیندووبوونی خۆیان دەکەن، ئەمەش خاڵی لاوازیانە، بۆیەش ناتوانن خۆیان بە

سەنتەری ژیان دانەنێن و لە بازنەی ئیرەیی و یەکترشکاندن ڕزگاریان بێت. دار پرتەقاڵێك تەنها بە دار پرتەقاڵبوونی خۆی ڕازییە، بۆقێکیش لە کەناری ئاوێکدا، ئاوێك ڕەنگە گۆمێك بێت بە هۆی شکانی بۆڕیی ڕەئیسی کۆڵانێك، ڕازییە و بە دەنگە زیقنەکەشی گۆرانی بۆ بۆقێکی مێینەی ئەوبەر گۆمەکە دەڵێت. تەنها مرۆڤ بە بەشی خۆی ڕازی نییە، فریشتە و ئیبلیسە لە یەك کاتدا، ئاو و سەراب، چاکە و خراپە و منداڵی و گورگێك لەناو یەك جەستەدا کۆ دەکاتەوە، کۆترێك هەتا دەمرێت خۆی و نەوەکانی، کۆترن و بەس، پێناسە کراوە و دەیناسین، تەنها مرۆڤ گرەنتی نییە سبەی دەبێت بە چی؟!

زۆربەی نووسەرە مەزنەکان درکیان بەو زیاد لە پێویست زیندووبوونەی مرۆڤەکان کردووە، "مێرسۆ"ی ڕۆمانی "نامۆ"ی ئەلبێر کامۆ، "زۆربا"ی نیکۆس کازانتزاکیس، پاڵەوانی ماڵئاوا لە چەکی هێمنگوای، "ئۆرلیانۆ بویندیا"ی سەد ساڵ تەنیایی مارکیز، "نالی"ی شارەزووری، ئەبونەواس و هەتادوایی.. دەیگوت پەڕی باڵی باڵندەیەکی بریندارن و بە ئاسماندا دەسووڕێنەوە، قاچیان لەناو چیمەنتۆی زیاد لە پێویست زیندووبوونەوە نەچەقیبوو، خاوەنی سیمایەکی دیاری ئایدۆلۆژی نین، خۆیان لە سەرووی سروشتەوە نابینن، تەنانەت نالی خۆی لە سەرووی کەرێکیشەوە نابینێت کە دەڵێت:

چەنـــد خـــۆش بە زمـــانی حـــاڵی دەیگـــوت نالیـــا

هەردوو حەیوانین ئەتۆ گوێ کورت و ئەمـن گوێدرێژ

ئەو مرۆڤانەی پێیان وایە گەردوون لەگەڵ لەدایکبوونی ئەوان دەستی پێ کردووە و بە نەمانی ئەوانیش کۆتایی دێ! هەر ئەم زیاد لە پێویست زیندووبوونەش کۆیلەکانی ئایدۆلۆژیای هێناوەتە بەرهەم.

مرۆڤەکان خۆیان بە هەڵۆ دەزانن و لە ڕاستیدا لە شێوەی ئەو مریشکە بەستەزمانانەن کە لە دوکانێکی سێ بە دووی پلاستیکیدا بە دیار شیشێك هیتەرەوە، لەتەنیشت یەکتر گرمۆڵەبوون و چاوەڕێی سەربڕین دەکەن.. هەر زانینی ئەم چارەنووسەیە وای کرد هێمنگوای خۆی بکوژێت و کامۆ ئۆتۆمبێلەکەی خێرا لێخوڕێت و بمرێت، کازانتزاکیس تۆبە بکات و یەکشەممان بە هەنگاوی قورسەوە بڕواتە کلێسا، مارکیز تووشی زەهایمەر بێت و نالی سەری خۆی هەڵگرێ و ئەبونەواسیش شەو و ڕۆژ ئەلکهوول بخواتەوە.

# ئاوابوون

وردەوردە تەندروستیم خراپتر دەبێ، مرۆڤ تا گەورەتر بێت ئاوڕ لە شتی بچووك دەداتەوە، بچووك و مانای گەورە، کە گەنجیت یاری لەناو بەفر دەکەیت و وێنە دەگریت، کە گەورە بوویت لە بەفردا خەیاڵت بۆ ئەو خێزانانە دەچێت ئاگریان لەو دارانە بۆ ناکرێتەوە کە بە فرمێسکی دایك و باوکەکە تەڕ بوونە، تەنانەت خەیاڵت لای ئەو سەگ و پشیلانەیە بەو سەرمایە چی دەخۆن؟

کە گەنجیت خەون بە گۆڕینی جیهان و کۆمەڵگەوە دەبینیت، کە پیر دەبیت لە خەونەکان دەرت دەکەن، کەسێك نادۆزیتەوە وەکوو جاران لە نامەیەکدا پێت بڵێ: بەیانیت باش.

دوێنێ شەو خەوم پێتەوە بینی، ئەرێ تۆ باشیت؟

کە گەنجیت گلەیی لە دنیا دەکەیت، کە پیر بوویت لە جەستەت.

ئاراستەی دوعات بۆ لە خزمەکانەوە دەگۆڕێت بۆ پەلەکانی لەشت.

ئەوەی ئەم جەستە و ئەم ماڵ و گەڕەکەی لە نەخۆشی و پیربوون و مردن شاردۆتەوە، تەنها بۆنە خۆشەکەی تۆیە، زۆری خایاند تا بزانم ئەو ژن و منداڵانەی بە کۆڵانەکەی ئێمەدا تێپەڕ دەبن ئەو ئاهانەی هەڵیدەکێشن بۆ من و کەسوکارە باشەکەم نین، بەڵکوو بۆ ئەو بۆنە خۆشەیە کە بۆت ناردووم و ڕۆژانە پرژەیەك بەم دەفتەرە دادەکەم کە ئێستاش نازانم هی منە یان هیی ئەو کتێبانەی خوێندوومنەتەوە؟

دەی مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکی دەقئاوێزانە، هەستێك نییە پێشتر هەستی پێ نەکرابێت و جووڵەیەك نییە ئێمە دامانهێنابێت، هەر کەسە و ئەلقەیەکە بەوانی ترەوە گرێدراوە، تەنها چاوقاییم و خۆپەرستەکان سەرکۆنەی بیرۆکەی ئەلقەداری دەکەن، دەی لە لەحزەی مردندا دەیانبینینەوە، چۆن هاواریان هەمان هاواری یەکەمین مردووە!

دانی پێدا دەنێم دەبووایە ناسکتر و جوانتر ئەم دەفتەرە پڕ بکەمەوە، لەوپەڕی دنیا دەفتەرت بۆ نەهێناوم تا مشتێك خەفەت بخەمە سەر خەرمانی خەمەکانت، بەڵام دەڵێی چی؟ کێشەکە لەوەدایە هەموو ئەوانەی خۆشەویستی دەکەن: سەرەتا بە خۆشی و پێکەنین و گرنگیپێدانەوە وا دەزانن بەرەو بەختەوەری دەچن! سەرەتا وەکوو ئاوی سازگار دەدوێن، لە ڕووباری نەمریدا مەلە دەکەن، دواتر دەزانن جۆگەڵەی خۆشەویستی تەنها بەرەو یەك سەرچاوە دەڕوا، کانیی فرمێسك. بۆیە بەردەوام دەبێتە فیلم و دراما و چیرۆك و شیعر، دەبێتە سەردوولکە و حەیران و لاوك،

هەویرێکە دەبێتە هەموو نانێك، تەنها کولێرەی هاوڕێیەتی نەبێ! ئەویش لەبەر هۆکارێکی سادە، چونکە خۆشەویستی بە چارەسەری نیوەناچڵ ڕازی نییە: یان هەمووی یان هیچ.

وشەکانی ناو ئەم دەفتەرەش بەناچاری بەرەو کانیی فرمێسك چوون، نایشارمەوە، کە هەوڵم دا بیشارمەوە، بەڵام پشتی وشەکان، پشتی ڕستەکان وەك لە ئەشیعەی مانایان دەردەکەوێ، ئاشکران، وەك دڵۆپی فرمێسکی ئەو پیاوەی لە تازیەی کوڕەکەیدا پێی شەرمە بگری.

هەمووومان لە قسە دەگەین، ئەوەی بە شوێنیدا دەگەڕێین کەسێکە لە بێدەنگیمان تێبگات، چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ هەست دەکەین جەدوای قسەکردن لەبارەی ژیانەوە کەمتر دەبێتەوە، ڕۆلان بارت قسەیەکی هەیە دەڵێت: ئەوەی هەمبوو بۆ گوتن، بەرەبەرە کەمبوویەوە، تەنها ئەوە مایەوە کە ناتوانم بە کەسی بڵێم.

لە ڕۆژگارێکدا یەکترمان ناسی، تیایدا دایك و باوکەکان پەشیمان ببوونەوە لەوەی چەند ماندووبوون تا منداڵەکانیان فێری قسە کرد، تا گەورە ببن و بگەنە ئەو سەردەمەی تیایدا قسەکردن سوودی نەمابێ.. ئێمە هەمووومان لە مەجلیسەکان، لە چایخانەکان، فەرمانگەکان، مزگەوتەکان، لە کۆڕەکان قسەی باش دەکەین، کەچی دۆخی هەمووان بەرەو خراپتر دەچێت! بە دۆخی تەندروستی منیشەوە، لە شێوەی ئەو پیرەمێردانەی بۆم باس کردی، پێکەنینم لەکۆتایەکانیدا دەبێتە کۆکین، گەیشتوومەتە ئەو تەمەنەی تیایدا گرنگ نییە چی دەخۆیت، هێندەی گرنگە لەگەڵ کێی

دەخۆیت؟! گرنگ نییە لە کوێی هێندەی گرنگە لەگەڵ کێی؟!

دەڵێن مرۆڤ ئەو کاتە پیر دەبێت کە ژمارەی یادەوەرییەکانی زیاتر بن لە ژمارەی خەونەکانی، تەنانەت خەونی ئەوەی لەتەنیشتت دانیشم و بەیەکەوەش پیر بین، بووە یادەوەری.

چەندی گەڕام بۆ خواحافیزی لە کەسێك کە لە خۆتت خۆشتر بوێت، نەمبینی لەو ماڵئاواییەی نیکۆس کازانتزاکیس جوانتر:

ئیتر کەرەستەکانم کۆ دەکەمەوە، بینین و بۆنکردن و دەستلێدان و تامکردن و بیستن و عەقڵ..

تاریکی داهات و ئیشی ڕۆژم تەواو بوو، وەکوو ژووژك دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەکەم، بۆ ژێر زەوی..

نەك لەبەر ئەوەی ماندوو بووم و توانای ئیشم نەمابێت، نا ماندوو نیم، بەڵام خەریکە خۆر ئاوا دەبێت..

خۆری تەمەن...



## لەو
## گولەگەنمانەی
## بوونە گسک

ئەو سڵاوانەی نەمانکرد

ئەو شەوشادانەی لەبەر خۆمانەوە گوتمان و بەربوونەوە

دوای هەزاران هەزار ساڵی تر شوێنەوارناسەکان دێن و

ئێسقانی وشەکانمان دەدۆزنەوە

تێدەگەن ئەم وڵاتە مەیدانی چ بەشەڕێکی دڵڕەق بووە!




دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAM PUBLICATION